# موناجات

"مەحوی"

خودایا ئیرادەی موناجاتمە،<br>
نیازی دووسێ عەرزی حاجاتمە

بەدەرباری هەرفەزڵتە ئیلتیجام<br>
بەرەحمەت نیشانم دەرێگەی نەجام

بە ( وَالذّاٰرِیاٰت)ی هەناسان وئاه<br>
کەبەر بادەدەن کێوەکانی گوناه

بە ( والطّور ) ی قەلبی تەجەللا قەرین<br>
بە ( والنّجم )ی پڕ ورشەی جەبین

بەدوو ( وَالسّماٰ ) یەعنی دوو مەرتەبەت<br>
یەکێ مەرتەبەی عیشق ویەک مەعریفەت

بە ( وَالفَجْرِ )ی رووناکی بن چینی زولف<br>
کە فەجرێکە سادق بەبێ کیذب وخولف

بە (وَالشّمْسِ)ی پڕ نووری روخساری یار<br>
بە ( وَاللّیْل )ی خاڵ وخەتی موشکبار

بە ( وَالتّین)ی عوشاقی دڵ پڕلەخوون<br>
کەبێ تینن وزەرد وزارو زەبوون

بە ( وَالعاٰدِیاٰت) ئەسپی هیمەت دەوان<br>
بەرێی عیشقدا تاسەحەر شەبرەوان

بە ( والعصر )ی ئەوعەسرەفەرڕوخ زەمەن<br>
کەناوی بەعەسری سەعادەت دەبەن

بەسۆزی دڵی عاشقان تاسەحەر<br>
بەئاهێ کەئەڕوا هەتاجێی ئەسەر

ببەخشە زوبانێ لەرووی مەکرەمەت<br>
تەڵەبکا بەدایم لەتۆ مەغفیرەت

لەدرەگاهی تۆدا نەنێم گەرسەرم<br>
شەوان ئاه وناڵەم لە بۆکێ بەرم

بەزاری وبەگریان وهاوارو ئاه<br>
تەڵەبیە لەتۆ " مەحوی"مەحوی گوناه

# نیوەرۆک

روو بەرگ
دیا ری
محەممەد
ئیبڕاهیمیا ن

پشت بەرگ
دیا ری
عومەر با پیری




تلفن ۳۵۸۰۰

ارومیه : خیابا ن مدنی ـ سەراە خیام‌شمالی ـ انتشار ات صلاح‌الدین ایوبی ـ صندوق پستی ۷۱۷


بەناوی خـوا

لـە ژمـارەی پێشـــوودا باسێکی نوێمان دەست‌پێکـرد و زانایان و خاوەنڕایـانـی دڵسۆزمان بانگ هێشتن کرد تا لەسەر مەسەلەی تەیاربــوون بە چەکی عیلم و ئیمـان ورد بنەوە و خۆی پێـوە مـانـدوو بکەن . ئەوەشمان گوت‌کـە نەبوونی یەکێک‌لەم دوو چەکە کەمایەسی یەکی گـەورەیـە و بەختەوەری بەبێ یەکێک لـەم دوو نیعمەتە دەست‌ناکەوێ .

ئێستا بەم هیوایـە کـە هەموو لا هیچ نەبێ بـڕووکـە ئیمانێکی پێویستمان هـەیـە، درێژەی ئەم باسە بۆداهاتـوو هەڵدەگرین و باسی بایـەخ و پێویستی خوێندن دێنینە گۆڕ و بەختەوەرانە بایەخ

گرینگی وەدەست هێنانی ئاگاداری و زانین ئەوەندە روون و ئاشکرایە کەپێویستی بە بەڵگە و دەلیل هێنانەوە نیە و هێنانەگۆڕی ئەم باسە بە مانای شی کردنەوە و کلا کردنی دڕدۆنگی و دوودڵی نیە بەڵکوو وەبیر هێنانەوە و وشیارکردنەوەیە کە بۆ ئەوە ژەنگی کەمتەر خەمی لەسەر دڵ و گیانی جوان وبێ گەردی ئازیزانمان بکرێنین تا نەبێتە کۆسپی رێگای هەڵدان و پێگەیشتن و نەتوانێ مرۆ و ئیستعدادێکی زۆر بەند بکا و سامانێکی بەرفرە بوەستێنێ و لەنێو ببا. لە پێشدا بۆ چوون ورای جۆراوجۆر لەسەر باسی پێویستی وەدەست خستنی عیلم وزانست دەکەینە سەرەتای باسەکە و لە سەری دەدوێین.

**پیرۆزی عیلم لەرێبازماندا**

پێش هەموو لێدوانێک لەسەر پیرۆزی زانست وناسین لەبۆ چوونی رێبازی گیانبەخشی حەزرەتی موحەممەد (د.خ) کەلک وەردەگرین و دەچینە نێوقووڵایی باسەکەوە.

وردبوونەوە ولێکۆڵینەوەیەکی بەزانستەوە ئەم راستی یە دەردەخا کە لە ئیسلامدا کەم باس وەک زانست و ناسین سەرنجی دراوەتێ.

قورئانی پیرۆز بەئاشکرا زانست بە تەرازووی هەڵسەنگاندنی "بەسەرەوەبوون" دەزانێ. هەر وەک پارێز دەکاتە بنەمای لێک هەڵاواردنی بەشەر.

ئەم سەرنج و بایەخە لە دینە ئاسمانی یەکانی دیکەدا بەم گرینگی یە نابیندرێ.

بەکورتی لە ئایەت و حەدیس وریوایەتان وادەردەکەوێ کە بێ زانین و ناسین موسڵمانەتی باوەڕێکی تەق و لەق و بێ بناخەیە. جا دەبێ هەرواش بێ چون ئینسانی نەزان ئەگەر رێگاکەشی راست بێ پاداشی نیە. لە نێوان وەها ئینسانێک و ئینسانێکی کە نەیزانیوە و بە هەڵە چووە هەر ئەوەندە فەڕق هەیە کە ئەمیان بە هەڵکەوت رێبازی هەقی دۆزیوەتەوە و ئەویان بە هەڵکەوت لارێ بووە

کەوابوو تەنیا شکڵ و شێوەی هەڵوێست گرتن بەتەنێ بەس نیە بەڵکوو ئەم هەڵوێستە دەبێ بە زانست و ئاگاداری یەوە گیرابێ .تاکوو ببێتە هۆی رزگاری و لە ئادەمیزاد قەبووڵ بکرێ.

لەم پێیەدا باس زۆرن کە وردبوونەوە و شی کردنەوەیان زۆر دەکێشێ و لە وزەی ئەم وتارەدا نیە

**زانست و ژیانی مرۆڤ**

ژیانی بەرتەسک و ساکار لە سەدەکانی رابردوودا نەیدەتوانی قانوون وزاکوونی حاکم بەسەر ژیاندا بە مرۆڤ بناسێنێ. ئەمڕۆ پێشکەوتی

---

مرۆڤ لێبڕاوی کردووه تا وێڕای پەیوەندی لەگەڵ جیهان سەبارەت بە پتر ناسینی قانوونی حاکم بەسەرتەبیعە ـ تدا حەول بدا ئەم حەولە بەربڵاوە کە بۆ پتر زاڵ بوون بەسەر تەبیعەت ولەنێوبردنی کەندوکۆسپ ووەدەست هێنانی بارودوخێکی بەرێ وحێ تری ژیان سەری گرتووە ،زۆر بەجێ بووە و زۆریش بەجێیە .

هەر وەک ئەگەر ئیمڕۆ وێڕای زۆربوونی حەشیمەتی دونیا گەڵاڵەی پێویست بۆ ژیانی مرۆڤ لە هەموو بارێکەوە بەتایبەتی باری ئابووری و سیاسی یەوە دانەرێژرێ چەرمەسەری و کۆسپێکی یەکجار زۆر لە داهاتوودا خۆ دەنوێنن . بەداخەوە لە رێبازی پەرەپێدانی پەیوەندی دوو لایەنەی کۆمەڵی ئینسانی و کەلک وەرگرتنی بەجێ لە تەبیعەت وێڕای هەموو بارەکانی ژیانی مرۆڤ هەڵە و لارێ یی ریشەداری ئەو کە لە مێشکی ئێسقانی مردووە بۆ دەستەڵاتداری شەیتان هاوار دەکا ، هەل بەدەرفەت دەزانێ و بنەمای ژیانی تووشی ئاڵ و گۆڕێکی بە زەبر و زەنگ دەکا کە ئەوکارە لەگەڵ بێ هێزی زانستی رابردووی ئەو یەک ناگرێتەوە . هەرچەند زۆرمان بەدڵ نەبێ بەڵام ئیدی جێی بەسەردابازدان و چاو پۆشی نیە .

ئێستا گەشە وپێشکەوتن وێڕای تێهەڵچوونی هێزوتوانا و دەستەڵاتداری مرۆڤ بەسەر گۆی خاکی وبگرە سەرەوەتریش ... لە دەروونەوە هەڕەشە لە بناخەی ژیانی ئینسانی دەکا

ئێستا زانست وەک کێردێکی دوو دم وایە . هەم دەتوانێ پەردەی رەشی نەزانی بدڕێ و ئینسان لە بەرابەر مەترسی بیۆلۆژیک و... دا بپارێزێ ، هەم دەتوانێ کەرەستەی دەستەڵاتی ئەوان تاغووتان بێ کەدان بە ژیانی هەزاران ژن وپیاو دانایەنن .

بەم جۆرە زانستوناسینی ئیمڕۆ هەر وەک دەورێکی باش و پڕبایەخی لە درێژە و سەرکەوتی ژیانی مرۆڤدا هەیە دەشتوانێ ویستی چەپەڵی شەیتانیش لە هەموو زەمانان زیاتر پێک بێنێ . ئەوەی داخ وکەسەری هەر خاوەن دڵ و دەروونێک زێدە دەکا ئەوەیە کە بەشی هەرە زۆری دەستمایە و کەرەستە وحەول و دەولی زانستی لە دونیادا بۆ حەسانەوە وگەشەونەشەی ژیانی بەشەر و رزگارکردنی لەگێژاوی هەژاری وچارەڕەشی نیە بەڵکوو بۆ خۆسەپاندن و زێدەبایی دەستەڵاتی دنیاخۆران و دارو دەستەکەیان بەخت دەکرێ .

ئەگەر کەرەستە و دەستمایەی عیلم وزانست لە رێبازی دروست وبەجێ لەکار بکرێ دڵنیاین دیمەنی ئێستای دونیا بە تەواوی دەگۆڕێ و شوێنەواری هەژاری و فەڕق و جودایی و زوڵم وستەم دەبڕێ

بەڵام دیسان بەداخەوە راستی یەکی تاڵی دیکە ئەوەیە کە ئەوانەی بێ وچان بۆ لەکۆتکردن وچەوساندنە ـ وەی چەوساوەکان خەریکن تاگەڵاڵەیەکی نوێ دابڕێژن پتر لەوانە کە مرۆڤیان خۆش دەوێ لە عیلم وزانست بەهرە وەردەگرن وئەمبەهرەوەری یە زامنی هێز ودەستەڵات و حاکمەتی ئەوانە .

جا ئەگەر خۆمان بەئینسان دەزانین ودۆستی مرۆڤین دەبێ ئەمە لەگوێ بگرین کە :

**هەرووەک شەڕەف و پیاوەتی فەرمان دەدا لە بەرابەر هەموو زۆرداران و ئەوانە کە هێرش بۆ سەر هەرێمی مافی مرۆڤ وعەداڵەـ تی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری وفەرهەنگی دەبەن و چەوسێنەرانی جیهانی لە سەرووی هەموانن رابوەستین و بەرەنگاری زوڵم و ستەمی ئەوان بین ، پێ لەسەر ئەوەشدا دەگرینکە هەست بە پێویستی جیهادی عیلمیش بکەین بۆ ئەوە کە سنعەت و تکنۆلۆژی لەدەست دوژمنانی مرۆڤایەتی دەرکێشین و دەرفەتی کەلک وەرگرتن لەم هەموو دەستمایە وکەرەستە لە پێنا و بنەبڕکردنی شوێنەواری**

کەم‌دەستەڵاتی وهەژاری پێک بێنین تا هەموو کەس جا خاوەنی هەر تایبەتی و لەهەر نیژاد ونەتەوەیەک بێ،بەهرەی لێ وەربگرێ .

**دریژەی هەیە**

# بسمه‌تعالی سرمقاله

درشماره پیش ضمن گشودن باب‌جدیدی از بحث‌و دعوت از اندیشمندان و صاحبنظران دلسوز جهت‌برخورد جدی با مسئله ، به ضرورت‌تجهیز و مسلح بودن به عناصر علم و ایمان اشاره کرده و یادآور شدیم که‌فقدان هر یک از این دو ویژگی ،کاستی بزرگی برای آدمی محسوب میگرددودستیابی به سعادت‌ابدی برای فاقد هریک از این دو نعمت غیر ممکن است . اکنون با این امید که همگی از حداقل ایمان لازم برخورداریم بحث در اینباره را به فرصتهای آتی موکول کرده وحسب‌وعده داده‌شده در اهمیت ولزوم ، تحصیل به‌بحث مینشینیم .

خوشبختانه اهمیت و لزوم کسب‌آگاهی و معرفت آنچنان واضح وروشن است‌که نیاز به‌بحث‌استدلالی و اثباتی ندارد و لذا طرح این مقوله دراینجا محض‌تاکید بروجود شبهات‌و ابهامات و آنگاه ضرورت‌پاسخ به آنهانیست‌بلکه جنبه تذکر و یادآوری وهشدار داردتا اگر زنگار غفلت‌تاکنون پرده صاف‌قلوب‌عزیزانی را تیره کرده ومانع از رشدوتعالیشان شده ، و استعدادهای قابل توجهی را محبوس و سرمایه‌های فراوانی را راکد و نابود کرده از چهره جان زدوده ، شود .ازاین رو بعنوان یک بحث مقدماتی اهمیت‌وضرورت تحصیل علم ودانش راازنقطه نظرات مختلف موردبررسی قرار میدهیم .

**قداست علم در مکتب**

بیش از هرسخنی ازقداست علم وفضیلت‌ودانش از دیدگاه مکتب‌حیاتبخش محمدی (ص) استفاده کرده ونتایج بحث خود را تنفیذ میکنیم. یک تفحص‌عالمانه و محققانه بر این حقیقت‌تاکید دارد که کمتر موضوعی باندازه علم و معرفت‌دراسلام مورد توجه و تاکید قرار گرفته است . نخست‌آنکه قرآن مجیدبصراحت دانش رامیزانی برای تشخیص برتری عنوان میکندوهمچنانکه تقوا را مایه‌کرامت‌و برتری فرد در برابر دیگر افراد جامعه میشمارد،از علم‌وآگاهی نیز بعنوان یکی ازویژگیهای ممتازکننده بشر یاد میکند درهمین راستا حدیث‌شریف منسوب به‌رسول خدا (ص) مبنی بر وجوب‌طلب‌علم و دانش نیز نشانگر عمق توجه مکتب به این مسئله بسیار اساسی ومهم است .بطوریکه این توجه را درهیچ یک از ادیان آسمانی بااین شدت‌سراغ نداریم .

خلاصه کلام آنچه از مجموع آیات‌وروایات‌چنین مستفاد میشود که‌بدون کسب‌علم‌ودانش ادعای مسلمانی در واقع‌از همان سطح ادعا فراتر نمیرود منطقا" هم باید اینطور باشد. زیرا انسان فاقد ایمان درصورتی که در مسیر صحیح هم گام بردارد اجری ندارد و اصولا" بین اووکسی که ناآگاهانه بخطا رفته است‌تنها دریک اتفاق ، فرق وجود دارد. یعنی یکی اتفاقا در جبهه حق‌قرار گرفته و دیگری اتفاقا" درمسیر باطل گام نهاده است .بنابراین نوع وشکل موضعگیری بتنهائی کافی‌نیست بلکه آگاهی از علت‌موضعگیری ( موضعگیری و عمل آگاهانه ) بعنوان شرطی اساسی در پذیرش‌اعمال مطرح بوده ،هست‌وخواهد بود. دراین زمینه بحث‌فراوانی وجوددارد که مداقه لازم در هریک از ابعاد آن نیازمند تفصیل قابل توجهی است‌کهاز حوصله این نوشتار خارج است .

**علم وحیات بشری**

اگر زندگی ساده وکم دامنه بشر در قرنهای گذشته آنچنان که‌باید بشریت را متوجه شناخت‌قوانین حاکم بر

هستی نمیکرد و فضای بسته‌و محدود آن دورانها اجازه ارتباط جوامع مختلف با یکدیگر رانمیداد، امروزه پیشرفت بشر که بیش از هر چیزی به تکامل معلوماتش در زمینه‌های مختلف حیات خود و سایر جانداران مربوط است او را ملزم کرده تا ضمن گسترش ارتباطات درسطح جهانی نسبت به‌شناخت بیشترقوانین حاکم برطبیعت اقدام کند. این تلاش گسترده که بمنظور تسلط هرچه بیشتربرطبیعت و رفع مشکلات ودستیابی به وضعیت مناسبتر زندگی صورت میگرفت کاملا" موجه به نظر رسیده‌و میرسد. بطوریکه اگر امروزه همراه با رشد جمعیت جهانی طرحهای لازم برای زندگی انسان در ابعاد مختلف بویژه بعد اقتصادی وسیاسی ریخته نشود، مصائب ومشکلات بطور جدی ظاهر میشوند. متاسفانه در راستای گسترش ارتباطات متقابل جوامع انسانی و بهره گیری اصولی وصحیح بشر از طبیعت و همراه با بزرگ شدن همه ابعاد زندگی آدمی انحرافات ریشه‌دار وی که تا مغز استخوانش نفوذ کرده و حاکمیت شیطان رافریاد میزند از فرصت بهره جسته و کانون حیات را دستخوش سلسله تحولات تند وخشنی میسازد که اینکار با ضعف علمی گذشته او عمای نبود. هرچند بسیار ناخوشایند شد اما دیگر قابل اغماض و چشم‌پوشی نیست.

اینک پیشرفت سریع آدمی در کنار روند رو به تزاید قدرت، تسلط وحکومت بنی آدم برکره خاکی وبلکه بالاتر و... از درون پایه‌های زندگی انسانی رادر معرض تهدیدجدی قرار داده است. امروز علم بمثابه تیغی دودم، هم پرده سیاه جهل را دریده و آدمی را دربرابر مخاطرات بیولوژیک و... حفظ نموده‌وازسوی دیگر ابزارتسلط طواغیتی شده‌است که امروزه زندگی هزاران زن و مرد را انکار میکنند.
بدین ترتیب علم همچنانکه امروز دارای نقش مثبت و ارزنده‌ای در ادامه‌وارتقاء کیفیت زندگی انسان است امکان تحقق نیات پلیدشیاطین را بیشتر از هرزمان دیگر فراهم آورده است. آنچه که تاسف هر صاحبدلی را تشدید میکند اینست که متاسفانه بخش بزرگی از سرمایه‌ها و امکانات وسرانجام تلاشهای علمی در سطح جهانی درراستای ارتقاء سطح زندگی بشروخارج ساختن آن از ورطه فقر و بدبختی صورت نگرفته، بلکه در راه تثبیت وافزایش قدرت جهانخواران وایلدیشان معروف میگردد. اگر امکانات و سرمایه‌های علمی در مسیر صحیح و اصولی بکار گرفته میشد قطعا" چهره جهان بکلی دگرگون میشد و از مظاهر فقر و تبعیض و ستم آثاری وجود نمیداشت.
جنبه تاسف انگیز واقعیت آن است که در شرایط حاضر همانها که‌برای به زنجیر کشیدن و بهره‌کشی ازمستضعفین پیوسته مشغولند تا طرحی نو دراندازند، امروز بیشتر از مجموعه بشردوست جهان از ثمرات پیشرفتهای علمی بهره ـ مندند واین بهره‌مندی بیشتر تسلط آنها را تضمین کرده است. ازاین رو اگر خودرا انسان و انساندوست میدانیم باید این عبارت را آویزه گوش کنیم:

همچنانکه شرف و مردانگی قاطعانه به مقاومت و مقابله علمی دربرابر حمله‌زورمداران متجاوز به‌حقوق انسانی، حریم عدالت اجتماعی، سیاسی، اقتصادی وفرهنگی و در راس آنها استکبار جهانی حکم میکند، بر ضرورت و وجوب جهاد علمی بمنظور خارج ساختن حربه‌های صنعت و تکنولوژی از دست دشمنان بشریت و بهره‌گیری از همه امکانات و سرمایه‌ها در راه محو مظاهر ضعف وفقر و فراهم ساختن بالسویه امکانات برای همه‌افراد بشر از هر مشخصه‌نژادی وقومی... با همان جدیت تاکید دارد.

ادامه دارد

# ئیمە و باوەڕ

مستەفا زمزیری

زۆری و فراوانی بوونەوەر بە کەس ئەندازە ناگیرێ ، نە بەهیچ دەپێورێ ونە دەکێشرێ . بەشەر وەختێک کەرەسەگەلی زانستی وەک تێلیسکۆپ وکەشتی هەوایی ( سفینەفضایی) و... لەدەست دانەبوو پێی وابوو بوونەوەر لەو زەوی یەدا کە ئەو لە سەری دەژی و لەو عاسمانە شینەی دا کە بە چاو بەسەر زەوی ڕۆکراوەو لەو ڕۆژ ومانگ و ئەستێرانەدا کە بە ڕواڵەت بەسەری دا هاموشۆ دەکەن کورت هەڵدێتەوە و ئیتر ئەگەر ببێتە باڵندەیەکی تیژباڵ دەتوانێ ئەمسەر ئەو سەری دنیا ڕاو بکا و بچێ سەر لە هەموو ئەستێرەکان هەڵێنێ و هەمرو کەلێن و قوژبنەکانی دنیا بپشکنێ .

بەڵام وردە وردەئادەمیزاد بەرەوپێش چوو ،لەخۆی و بوونەوەر پتر تێگەیی و بە بەرەوپێشتر چوونی زانست وپیشە (صنعت ) توانی باڵەفڕە بکا و تەنانەت لەباڵندە ـ کانیش توندتر و دوورتر بڕوا ، سواری فڕۆکە و کەشتی هەوایی بوو و خۆی گەیاندە میچی عاسمان و دەوروبەری ئەستێرەکان و لە دوورەوە وێنەی لێ هەڵگرتن و لێیان ورد بۆوە ، بە چەند شەو لەسەر گۆی مانگ میوانداری لەخۆی کرد ،بە تێلیسکۆپی گەورە گەورە ڕوانی یە بۆشایی دەوروبەری خۆی و بۆی مەعلووم بوو کە تا ئێستا هیچی لە هیچ نەزانیوە و بوونەوەر زۆرزۆرترەلەوەی ئەو بیری لێ کردۆتەوە و ئەوەی ئەو دیویەتی تنۆکەیەکە لە دەریا وپووشکەیەکە لەلۆدەکا .

بۆیەهات بۆ پێوانی مەودای ئەستێرە و گۆکان وبەربڵاوی بوونەوەرلەباتی بست و باڵ و گەز و گوریس،کیلۆمەتر ،ساڵنووری دیاری کرد. ساڵنوور مەودایەکە لە درێژی دا کەنوور بە چالاکی بڕینی ٣٠٠/٠٠٠ کیلۆمەتر لە چۆکەیەک (سانیە )دا ،بەساڵێک دەیپێوێ . وپێی لەوە نا کە مەودای نێوان هێندێک لە ئەستێرەکان بە ملیۆن ساڵنووریش زیاتر لێک دوورن ، بۆیە بە ناچاری ناوی لە بۆشایی دەوروبەری خۆی نا **بۆشایی** نەبڕاوە (فضای لایتناهی) .

بەڵام هەرچی بێ بوونەوەر بێ سنوور نیە و لەجێیەک هەر دەبڕێتەوە ، مەبەستی منیش ئەوە بوو کە هەر شتێک لەنێو ئەوبوونەوەرە فراوانەدا هەیە بە گیاندار وبێ گیانیەوە بە ورد و درشتی یەوە لە چکۆڵەترین بەشیەوە کە گەردیلە (اتم)یە بگرە تا گەورەترین بەشیوەک ڕێکخراوەرۆژی (منظومە شمسی)یەکانن هەرکامیان لەدەوری ئامانجێک دەخولێنەوە و لە یاساگەلێکی زانستی و سروشتی پەیڕەوی دەکەن . بەڵام ئادەمیزاد زیادەلە هەموو ئەندامەکانی دیکەی بوونەوەر سەرەڕای پەیڕەوی کردن لەو قانوونە وەک بەشەکانی دیکەی بوونەوەر ، لەبەر بەرخورداربوونی لە عیلم و ئیمان پەیڕەوی لە قانوونی تەکلیفیشی هەر کردووە وبە دوائامانجێکی گەورەتر و پیرۆزتردا گەڕاوە ،تێکۆشاوە ئەو بوونەوەرانەی کە بە پێی سروشت لە خزمەت وی دانین ئەوانیش هەر لە خزمەت خۆی باوێ ودەستەمۆیان بکا

بەڵێ ئادەمیزاد لەبەر سەرفەرازبوونی بە دوو سیفەتی عیلم وئیمان بیری لەم دنیا

پان وبەرینە کردۆتەوە ولەو بوونەوەرەبەر بڵاوو بێ بنە فکریوە و وەبەر شەپۆلی فکرانی داوە، لێی بۆتە عومەری خەییام و بە مەتەڵۆکە دای هێناوە،بەرواڵەت دنیای کردۆتە گرێ پووچکێکی نەکراوە، لەخۆی پرسیوە دەبێ ئەو دنیا زەلام وبەکڵۆشە لە بنیاتەوە بووبێ یان نا ؟

ئەگەر دروست کراوەکێ وکەی وبۆچی دروستی کردووە ؟ ئەمجار ئەگەر لەبن را بووبێ یا دروستکرابێ دەبێ برانەوەی هەبێ یا نا ؟ دیسان ئەم هەموو کارانەی لەنێو ئەو بوونەوەرە دا روو دەدەن ، هەڵسووڕانی رۆژ و مانگ و ئەستێران ،بارینی بەفر و باران، ساردی و گەرمی هەوا ،رووانی گیا و گوڵ، دڕک وداڵ و دارودەوەن،فرازۆو بوون و پیر بوون و پۆڵتکان ورزینیان،ئەوهەموو مردن وزیندوو بوونەوە و...بەدەستکێ یە ولە کوێوەیە ؟ کێیە و چیە ئەم هەموو ئاڵ و گۆڕەی پێوەیە ؟ هەروەها پرسیوەتی کە بەرەی مرۆڤ لەکوێوە هاتووە ولێرە چ دەکا و بۆکوێ دەچێ ؟ ئامانج لە پێک هاتنی ئەو ژیانە بە ژانە چیەوئاکامەکەی دەبێتە چی ؟ بلێی هەر ئاوا بەردەوام بێ، یان ئەو تۆمارە دەپچڕێتەوە ودنیا چۆڵ و وێران دەبێ و تەنانەت (پەپووش) نابێ تێدا بخوێنێ ؟

لەخۆی پرسیوە : خۆ هیچ دوور نەڕۆین هەر ئەو خۆرە کە هەمووومان کەلکی لێ وەر دەگرین و دەورێکی گرینگی لەژیانی گیان لەبەراندا هەیە خۆینی لەئاو دا نیە ، رۆژێک هەر دێ تینی تێدا نەمێنێ و هەموو گیان لەبەرانی سەر گۆی زەوی بکەونە تاریکایی و سارد و سەرما و بێ بژیوی و.. جا ئەگەر هەموو زیندەوەران چاویان لێکنا و ماڵ ئاوایی یان لەژیانی سەر ئەم عەرزە خواست ئێمە بەرەوکوێ دەچین ؟بلێی لە جێیەکی دیکە سەر هەڵدەینەوە وچاو بە ژیان هەڵێنینەوە ؟ وەک پیرە هەڵۆ لەخۆی پرسیوە :

چم بەسەر دێ کە نەمام ومردم
پەڕی بەربایەک وتۆزی وردم
تۆبڵێی راوی هەبێ لەو بەرزە
پاش هەموو چەرمەسەرەی ئەوعەرزە

دوای بیرکردنەوە و توێژینەوەیەکی زۆر زانیویەتی ئەو ماستە بێ موو نیە وبۆی مەعلووم بووە کە ئەو هەموو کارانەلەخۆوە جێ بەجێ ناکرێن، ئەو ژیانەی ئەو هەموو بەرنامەی بۆ دارێژراون شتێکی کەمبایەخ و چکۆڵە نیە . هەروەها گومانی لەوەدانەماوە کە ئەو مرۆڤە دەستڕۆیشتووەی هەموو بوونەوەری بۆ دەستەمۆ بووە وبەقازانجی وی دێت و دەچێ شتێکی سادە وساکارو کەم بایەخ نیە . و بێ ئەوەی خوا وەک بەدی هێنەری بوونەوەر و داهێنەری ژیان راستەو خۆ خۆی پێ بناسێنێ وەڵامی هەستی خواویستی دەروونی خۆی داوەتەوە و بڕوای بەخوایەک کە هەموو جیهانی لەبەردەستدایە ،هێناوەو سەری کڕنۆشی بۆ دانەواندووە .

بەڵێ بنیادەم بەهۆی عیلمەوە توانی بەشی خۆی لەدنیا حاڵی بێ وەڵامی زۆر لەو پرسیارانە بداتەوە کە خوتخوتەی دڵیان داوە وبۆی وەک گرێ پووچکەیەک وابوون.وبە هۆی ئیمانەوە توانیویەتی کەلکێکی باشتر لە عیلم وەربگرێ و گرێ وگۆڵەکانی دڵی باشتر لە بەین بەرێ وخۆی لەسەرسووڕمان وسەرەگێژەرزگار بکا و بەکورتی بە هۆی ئەو دووانەوە دەتوانێ و بۆی لوا کەبزانێ لە کوێ را هاتووە و لێرە چ دەکا وبۆکوێ دەچێ .

لە بەشی یەکەمی ئەم مەبەستە کە لە ژێر سەردێڕی (ئیمەوباوەڕ)دا خرایە بەر دەستی خوێنەرانی خۆشەویستگوتمان کە : ( ئیمان) لە ژیانی ئینساندا شوێنەوارێکی گەورەی هەیە و ئاقیدە وباوەڕی ئینسانهەر

ناوەڕۆکێکی هەبێ بەکردەوەش هەر ئەوە نیشان دەداو جوولانەوەی مرۆڤ بە پێچەوانەی نیوئاخنی بیروباوەڕ شتێکی نەگونجاوە بۆ نموونە چونکە هەموو کەس پێی وایە ئاور دەسووتێنێ کەس نیە لەرووی ئاگاهی و ئیختیارەوە خۆی دەئاور هاوێ ،یان چونکە هەموو کەس پێی وایە بەرق ئینسان دەگرێ کەس نیە خۆی بە بەرقەوە بکا

هەروەها گوتمان ئەگەر ئینسان کارێکی بە پێچەوانەی بیروباوەڕی خۆی ئەنجام بدا ئەوە بێ گومان باوەڕەکەی پتەو نیە و ئەو هێزەی نیەلەو کارەی بگێڕێتەوە ،ولەمباسەی پێشەوەدا بەم ئاکامە گەیشتین کە هۆی تەواوی ئەو کارەناڕەوانەی ئێمە ئەنجامیان دەدەین و هەموو کۆمەڵی گرتۆتەوە تەنیا وتەنیانەبوونیوبێ هێزی ئیمان وباوەڕەکەمانە و پێویستە هەوڵ بدەین باوەڕەکەمان هەتا دەکرێ پتەوتر بکەین وگومانیشلەوەدا نیە کە هۆیەکی هەرەگەورەی زۆرتربوون وپتەوتر بوونی باوەڕ، تێگەیشتن ولێ حالی بوونە لە ناوەڕۆک وئامانج و هەموو لایەنەکانی ئەو ئیمانە.

جاکەوابوو بگەڕێینەوە سەرباسەکە و دەڵێین : بەشەر بۆوەی باشتر بزانێ چیە و چکارەیە و بۆکوێ دەچێ ،بەکورتی بۆ وەی ، بتوانێ وەڵامی هەموو پرسیارێک لەمەربوونە - وەرەوە بداتەوە هۆشیارانە و لە رووی سروشتی خداویستی دەروونی خۆیەوە هانای بردە بەر بڕواهێنان بەپەروەردگاری جیهان و دانی بەوە دانا کە ناکرێ ئەو جیهانە بەو هەموو ڕێکی وپێکی یەوە بێ بەدی هێنەر و هەڵسووڕێنەر بێ

بەڵام بەرەی مرۆڤ وەنەبێ بەو بیرکردنەوەش لەهەموو ئاوێکی پەڕیبێتەوە ، چون پێویستە خوای ناسیبێ و هەموو چاکە و خراپێکی لێک هەڵاواردبێ و قانوونە بایەخدارەکانی لەوانی بێ بایەخ جیا کردبێتەوە ، توانیبێتی بگاتە پلەیەک لە مرۆڤایەتی و بڕواداری.کەچی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ خەڵکیشی پێ خۆش بێ ،بەڵکوو لە خواپەرستی دا زۆر بە هەڵە چووە وزۆرستی درووستکراو و بێ دەسەڵاتی کردۆتە شەریک و هاوبەشی خوا ، جا لە ئەستێرە وئاگروشتی واوە بگرەهەتا دارو وبەردو گیان لەبەران و تەنانەت خۆراکی بەردەستیشیان واهەبووە بە هاوبەشی خوا داناوەو بتیان لێ سازکردووە وکڕنۆشیان بۆ بردووە وئەگەر برسیشیان بووە بێ بەزەیی یانە خواکەی خۆیان خواردووە . هەروەها لە یاساکانی کۆمەڵایەتیشدا زۆر نارێکی و بێدادی هەبووە و....

جابۆیە پەروەردگاری خاوەن بەزەییپاش بەدی هێنانی ئەم بوونەوەرەو دروستکردنی ئادەمیەکان لەسەر ئەم گردە زەوی یە هەر ئاوا وێڵی نەکردوون و لە سەرگەردانیدا نەیهێشتوونەوە.بەڵکوو بەرە بەرە و بە پێی پێویست و گۆڕانی هەل ومەرج وپێشکەو- تنی کۆمەڵی بەشەر کەسانێکی هەرلەنێو خۆیان وەک پێغەمبەران بن (د خ)هەڵبژردووە و هاورێ لەگەڵ هەموو قانوونێکیپێویست بۆ کۆمەڵی ئینسانەکان ڕەوانەی کردوون ، تا کۆمەڵ بەرەوپێشتر چووە ووای لێهاتووە کە بتوانێ تەواوترین و قانوون وزاکوون وەربگرێ ، جابۆ ئاخرین جار و ئاخرین کەس حەزرەتی محەممەدی(د خ ) رەوانە کرد بە قانوونێکە کە بە کەلکی هەموو سات و کاتێک و هەموو شوێن وهەل و مەرجێکی

کۆمەڵی بەشەریەوە بێ و لەدنیا و
قیامەت بی حەسێنێتەوە .

دیارە ئەوقانوونانەشکە پێغەمبەران
هێناویانن هەموویان هەر بەدینی ئیسلام
ناوبراون (ان الدین عندالله الاسلام) واتە:
بەراستی دین بەلای خواوە هەر ئیسلامە،
ئایەتی ١٩ی سوورەتی آل عمران .
و لە هێندێک فروعیات دا نەبێ جیاوازیان
نەبووە .

حاجی شێخ مورتەزای موتەهەری لەکتێبی
( مقدمەای برجهان بینی اسلامی)دا لە ژێر
عینوانی ( دین یا ادیان)دا نووسیویەتی
"...لە روانگەی قورئانەوە دینی خوای لە
ئادەمەوە تا خاتەم ـ مەبەست حەزرەتی
محەممەد (د.خ) یەکێکە ، هەموو پێغەمبەران
چ پێغەمبەرانی خاوەن شەریعەت و چ
پێغەمبەرانی بێ شەریعەت بۆ مەکتەبێک
بانگەوازیان کردووە ،ئەسڵەکانی مەکتەبی
پێغەمبەران کە دینی پێ دەگوترێ یەکێک
بووە،

جیاوازی شەریعەت یەکێک لە
زنجیرەیەک مەسەلەی فەرعی دا بووە کە بە
پێی پێویستی یەکانی زەمان وخسووسیاتی
ناوەندی ژیان وتایبەت مەندی یەکانی
خەڵکە بانگکراوەکە جیاوازی بووە،.... و
جیاوازی یەکی دیشلە پلەی فێرکردنەکان
تەعلیمات ، دابووە کە پێغەمبەرەکانی
دوایی هاوپێ لەگەڵ تەکاموولی بەشەر لە
پلەیەکی پێ هەڵاتردا فێرکردنی خۆیان کە
هەمووی لە یەک رێ و شوێن دا بووە
راگەیاندووە..."

بەڵێ ناوەرۆک و ئامانجی ئایینی هەموو
پێغەمبەرەکان هەر یەک شت بووە هەر
پێغەمبەرێک هاتووە هەم پێغەمبەرەکانی
پێشخۆی تەسدیق کردوون وبڕوای پێ هێناون
هەم مزگێنی هاتنی پێغەمبەری دوای خۆی بە
خەڵک راگەیاندووە

**دوایین ئایین :**

کتێبی ( محەممەدرسول الله ) نووسراوی
( محەممەد رەزا ) چاپکراوی ساڵی ١٣٩٥ ک
١٩٧٥ ز ،لە بەیرووت لەلاپەرەی ٥٩دا دەڵێ
" بوونی محەممەد (د.خ) بە پێغەمبەر لە
رۆژی دووشەممۆی حەڤدەی مانگی رەمەزانی
چل و یەکەمین ساڵرۆژی لە دایکبوونی
دابوو. واتە تەمەنی پیرۆزی لەوکاتەدا ٤١
ساڵی مانگی و ٦ مانگ و ٨ رۆژ بوو کە
رێکەوتی ٦ی (اغسطس)ی ساڵی ٦١٠ی زایینیە
وبە یەکیەتی هەموو مێژوونووسانی ئیسلامی
و غەیرە ئیسلامی قورئانی پیرۆز لەماوەی
٢٣ ساڵ دا هەمووی هاتۆتە خوار و دینی
ئیسلام بۆ هەمیشە تەواو کراوە و وەک
دوامیین ئایین و تەواترین دین بەکۆمەڵی
بەشەربێ سپێردراوە

قورئانی پیرۆز هەرچەند (معجزات علمی )
زۆری تێدایە وئاماژە بەزۆر مەسایلی
سروشتی و پزیشکی و جوغرافیایی دەکا و
بەکورتی هەرچەند پڕە لەوردیاتێکی
عیلمی ئەوتۆ کە زانایان دوای تێپەڕ
بوونی سەدان ساڵ پاشهاتنی قورئان
هەستیان پێ کردوون،واشهەر بە کتێبێکی
عیلمی ناژمێردرێ چونکە مەبەستی قورئان
ئەوە نیە کە لە یەکێک لەو زانستە
سروشتی یانە بدوێ، بەڵکوو قورئان دابی.
ژیانە و زۆرتر لە مەسەلەی ئەخلاقی و
کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی و نیزامی
ـ یەکان دو وە .

هەڵبەتە سەرچاوەی دینی ئیسلام تەنیا
بریتی نیە لە قورئان وبەس ، بەڵکوو بە
قورئان و حەدیس هەردووکیان سەرچاوەی
دین پێک دێنن .

پێویستە ئەوەشبڵێین کە چەندشتێکی
دیشهەن کە بۆ دەرهێنانی شەریعەتی ئیسلام
کەلکیان لێ وەردەگیرێ بەڵام ئەوانیش لە
چوارچێوەی قورئان و حەدیس بەدەر نین

# ئاوڕێک وەسەر:

# سوارە

ح. بەفرین

گۆڤاری "سروه" ماوەیەک لەمەوبەر دەرگای لەسەر شاعیرێکی بلیمەت وبەهرەمەندی وەک "سوارەی ئیلخانی" کردەوە منیش بە جێی خۆیم زانی هەوڵ بدەم بەکورتی هەندێک سیما و لایەنی شیعری نوێی ئەم شاعیرە نەمرە بە خوێنەری "سروە" بناسێنم .

کاتێ دەچینە سەر باسەکە بەر لە هەموو شتێ ئەم پرسیارە سەرقوت دەکاتەوە : شیعری نوێی "سوارە" لە چ ئاستێکدایە وتا چەند توانیویەتی دەستی نوێ کردنەوە بۆ گەردنی بەرزی شیعری کوردی بەرێ ؟

بەبڕوای من بۆ ئەوەی ئاسانتر لەگەڵ "سوارە"ی شاعیر ئاشنا بین، پێویستە ئاوڕێکی کورت لە شیعری نوێی کوردی بدەینەوە .

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ، لە کوردستانی عێراق شێعری کوردی شەپۆلی بزووتنەوە ـ یەکی نوێ خوازی تێکەوت . سەرئەنجام "گۆران"ی نەمر بەهۆی لێهاتوویی وتوانای بێ سنووری خۆی جڵەوی ئەو بزوتنەوەیەی گرتە دەست وڕەگ وریشەی شیعری نوێی لە باخی شیعری کوردیدا چەسپاند ، بەم کردەوە مێژوویی یەی گۆران زەمینە بۆ گەشەسەندن و پەرە گرتنی شیعری سەردەم خۆشبووکە دوای جەنگی جیهانی دووەمیش زۆر چرۆی نوێ وتازەغونچەی تر چاوی پشکووت ،شاعیرانی وەک ع . ح . ب،کامەران موکری ، دیلان ، جەمال شارباژێڕی، هەر یەک لە لای خۆیەوە پەرەی بە نوێ کردنەوەی شیعری کوردی دەدا . لەگەڵ ئەوەش هیچ کام لەو شاعیرانە ،بڕستی ئەوەی نەبوو لەو ڕێبازە گشتی یە دەرچێ کە "گۆران" دەقی پێوە گرتبوو .ئەم کێشەیە تا چەند ساڵ پاش مردنی ."گۆران"ی نەمر مایەوە ،پاشان بەپێی پێداویستی یەکانی ژیان شیعری نوێ شێوەی سەردەمی خۆی وەرگرت وبەرەوپێش هەنگاوی گرتە بەر.

بەڵام لە کوردستانی ئێران هەر چەند **هەژار وهێمن** وەک دوو شاعیری گەورە وبەهرەمەند ، لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە ، بەشداری نوێ کردنەوەی شیعریان کرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانیش بڕستی ئەوەیان نەبوو لەو دەقی ڕێبازە دەرچن کە خووی پێوە گیرابوو، کەچی هەر دوای مردنی "گۆران" لەم ناوچەیەدا شیعری نوێ بەرەوبارێ بۆ چوونێکی تر هەنگاوی هەڵگرت کە "سوارەی ئیلخانی" بە ڕابەر و پێشەوای ئەو دەست پێکردنە دەناسرێ ودیار و ئاشکرایە ئەگەر چی بە مردنی ئەو شاعیرە جوانەمەرگە ئیتر ئەو گڕ و بڵێسە گەرم وبەتینە وەک گەرووی نەمان هەڵی لووشیبێ کپ وخامۆش بوو ، وەک بڵێی ئەم جۆرە بەهرە وبڕستە هەر لە "سوارە"وە وەشابێتەوە و بە جوانەمەرگ بوونی ئەو چرا وەکوژێنەی لێکرا .

هەرچەند من ناڵێم ئەم چرایە بۆ هەمیشە کوژاوە ، بەڵام ئەوەندە هەیە حاڵی حازر کپ دەبینرێ وهەنگاوێک بەرچاو ناکەوێ درێژە بەو ڕێگا سەختە بدا .

ئەگەر دەسبەرداری ئەم باسە کورتە بین وبگەڕێینەوە بەرەو ماڵی خنجیلانە وجوانی شیعری "سوارە" لە گوڵبژێرێکی شیعرەکانیدا بە تایبەتی : **خەوە بەردینە ، کچی بەیان خێڵی درۆ ، هەڵۆ ، بانگەوازی پەنجەرە** دەبینین کە دەنگ و ڕەنگی تایبەتی " سوارە " یان پێوەیە .ئەوجۆرە تاقیکردنەوەو ڕۆشنبیری وشارەزایی یەی لەم

شیعرانەدا بە ڕاشکاوی پڕشنگ داوی ئاوڕدانەوەیەکی تازە و بیرکردنەوەیەکی نوێیە سەبارەت بە ژیان ولێکدانەوەی خەمی سەردەم پێم وایە شاعیرێکی وەک سوارە توانیو ـ یەتی بە تەواوی بناغە و بنچینەیەکی ڕێک وڕەوانی،دوای "گۆران" بۆشیعری نوێی سەردەم دابین بکا ، تەواوی ئەو دەق و خووەی هەرەس پێ بردووە کە شیعری کوردی تائەودەم عادەتی

لێرەدا ئەگەر لە شیعری "کچی بەیان" ورد بینەوەهەست دەکەین بەرپرسی شیعر لەئاستی ڕووداوەکانی ژیان بەرپرسیاری شاعیر بەرامبەر ئەرکی شیعر بەخۆ دەگرێ.بەرادەیەک ئەم بەرپرسی یەقووڵ دەکرێتەوە کە دوێنێ وئەمرۆ وبەیانی یەکتر تەواو دەکەن، بە درێژایی ڕابردوو بە بەرینی ئێستا ، بە قووڵی داهاتوودا ئەم گەشبێنی یەی شاعیر دەکێشێت و

لەڕوانگەی پێگەیشتوویی و تێگەیشتوویی شاعیریەتی "سوارە"وە ئەنجامی لێکدانەوەی خەمی ئاشکرا ونهێنی مرۆفەوە دەگا کە دەربڕینی دەردەداری ئێستای ژیان وسەردەمی ئێستا لە سووچی پرسیا ڕێکەوە سەرەتاتکێ لەگەڵ نەبووندا دەکا ،بۆ ئەو ئامێزە سارد و سڕەی لەئاستی گەورەیی بوونی ئەم سەردەمە جەنجاڵەدا والای کردووە :

پێوە گرتبوو. "سوارە" بەر لە پەل داوێ :

هەموو کەس پەی بەو ئەرکە مێژوویی یە بردووە وبەکردەوە سەلماندوویەتی کە: شیعر،کاتی ئەوەی هاتووە ڕووبەڕووی ڕووداوەکانی سەردەم بێتەوە هەڵبەت ئەم بەرنامە ڕوون و ئاشکرایەی "سوارە"ی نەمر لە چەشنە تاقیکردنەوە وشارەزایی و بۆچوونێکی تازە بابەتەوە ، سەرچاوەی گرتووە. لەپێناو پاراوکردنی دەردوئازاری خەڵکدا.

**پێم ئەڵێ : شەوکرە ، چیاچڕە**<br>
**ڕاستە گیانەکەم**<br>
**ڕێگەمان دوورە ،سەختە ،قاقڕە**<br>
**خۆشەویستەکەم**<br>
**لەپەنجەرەی نیوەتاکی بوومە-**<br>
**لێڵەوە**<br>
**چاوی من لەدیمەنی کچی**<br>
**بەیانی یە**<br>
**لەحەنجەرەی زەمانەوە**<br>
**گوێم لەزمزەمەی زوڵاڵی**<br>
**خیزە وردەکانی کانی یە**<br>
**تۆبڵێی ئەو خەوەهەستانی**<br>
**بێ ؟**<br>
**یانەئەوقافڵەوەستانی**<br>
**بێ ؟**

دەبینین " خەوە بەردێنە" ئەو ئەنجامی دەرک پێکردنەیە کە شاعیر فەلسەفەی ژیانی پێیەک لایی کردۆتەوە ،تێیدا سروشت و ژیانی کۆمەڵایەتی دوو شتی لە یەکچوون.لەوبزووتنەوەنەسرەو- تەدا وەک دوو کەناری دەریایەک کە بڕانەوەی بۆ نیە ، ئەم

شيعره شاكارێكی نه‌مردووی
شيعری كوردی يه .

لام وايه ،شاعيره‌تی "سواره"
ئه‌وه‌نده گوڕوتينی ناسكی بيری
له "خه‌وه‌به‌ردێنه"دا ماندوو
كردووه ، بۆ كۆڵ كردنی ئه‌و
رووداوه گه‌وره‌يه‌ی ژيان له
پێناو په‌ڕاندنه‌وه‌ی له‌گه‌رداوی
نه‌زانی يه‌وه بۆسه‌ر خاكی
تێگه‌يشتن،هه‌رئه‌وه‌شه چه‌شه‌يه‌كی
فه‌لسه‌فی داوه‌تێ وله‌م سه‌رده‌مه
جه‌نجاڵه‌دا لێكدانه‌وه ته‌نها

خه‌می "خه‌وه‌به‌ردێنه"يه وه‌ك
ئه‌وه‌ی ژيان به كۆتايی
تاريكی يه‌وه هه‌ڵ واسرابێ :

**ئه‌زانم ئه‌وانه‌ی كه‌پاراوی**
**ئاون ،بزارن**
**ئه‌زانم له‌رێگا مه‌ترسی**
**گه‌لێ ژه‌نگ‌وژارن**
**به‌ڵام كاكه**
**ئه‌وگشته**
**عه‌قلێ خه‌سارن**
**له‌ناوئه‌وهه‌مووئاوه**
**هه‌رچاوه‌يه‌ك باوی هه‌نگاوی،**
**خۆشه**
**به‌ته‌نيا ئه‌وه شاره‌زای كۆسپ**
**وكه‌ندالێ رێ يه**
**هه‌وه‌ڵ مه‌نزلێ زێ يه‌ئاواتی**
**به‌رزی زرێ يه**
**ئه‌زانێ له‌هه‌ڵدێره‌هاتی‌به‌هێزی**
**له‌ئه‌سكوندو چالايه هه‌ڵدان و**
**گێژی**
**په‌ڕۆی شينی سه‌رشانی ده‌ريايه**
**ژينی كه‌رێزێ**
**ئه‌زانێ له‌پێ ناكه‌وێ**
**پێ يه ، پێلاوی تاسه‌ی‌پياسه‌ی‌له**
**پێ بێ**
**نه‌وه‌ستان ئه‌وه‌ستێ به‌ده‌ستێ**
**كه‌خاراوی ئێش وسواوی**
**سوێ بێ**
**له‌هه‌رشوێنێ راماوه ، داماوه**
**كاری كراوه**
**ئه‌زانێ ئه‌بێ**
**هه‌ربژی وباژوێ تابژی**
**تابمێنێ**
**هه‌ناوی به‌هه‌نگاوه**
**نه‌سره‌وتنه ،كووله‌كه‌ی رۆحی**
**ئاوه**

شاعيرێكی گه‌وره‌ی وه‌ك"سواره‌ی
ئيلخانی "هه‌ر به‌وه‌نده مه‌يسه‌ر
نابێ، به‌ڵكوو به‌ئومێدی‌ئه‌وه‌ی
له ده‌رفه‌تی‌تردا بتوانم زۆر
مه‌سه‌له‌ی شيعری به‌رزی ئه‌م
شاعيره جوانه‌مه‌رگه ، نه‌مره‌به
وردی باس بكه‌م .

تێ بينی :

سه‌باره‌ت‌به‌وه‌ی " سواره‌ی
ئيلخانی زاده" به‌جێ يه يا
"سواره‌ی ئيلخانی" من پێم‌وايه
"ئيلخانی" دروسته زۆر له‌به‌ر
نووسه‌ر وشاعيرانه‌ی كوردستانی
ئێران كه من ديومن وئاشنايیم
پێ يان بووه ،"ئيلخانی" به
راستده‌زانن نازانم‌بنه‌ماڵه‌ی
شاعير خۆيان ڕايان به‌كاميانه
روون كردنه‌وه‌ی ئه‌مه‌ش زۆر
پێويسته له مه‌سه‌له‌ی ئه‌ده‌بداو
هه‌روا شتێكی سه‌رپێ يی نيه .

لەچلەمین ڕۆژی مەرگی ماموستا هێمن دا ،کۆبوونەوەیەکی زۆرگەورە لە شاری مەهاباد پێک هاتبوو شاعیران ونووسەرانی سەرانسەری کوردستان تەنانەت ماموستایانی دوور ولاتیش لەم کۆبوونەوەدا بەشداربوون. ماموستا هەژار کەبەداخەوە لەو کاتەدا بەهۆی نەخۆشییەوە نەیدەتوانی بێتەکۆڕەکە ،

ئەوشیعرانەی ژێرەوەی بۆشینی هێمن ئامادە کردبوو. قەرارابوو هاوکارێکی ئێمە بڕواتە خزمەتی وەریان گرێ وبۆڕۆژی کۆبوونەوەکەبۆمان بێنێتەمەهاباد کەبەداخەوە لەبیری دەچێ وبەوەخت شیعرەکەمان پێ نەگەیشت. لەسەر داخوازی جەماوەری خوێنەرانمان ئێستا ئەو شین گێڕییە بلاودەکەینەوە.

---

# شین گێڕی

**«هەژار»**

کاک هێمن برای شیرینم
چاوان دەگێڕم نات بینم
زل کوێران دەلێن مردووە
کۆچی یەکجاری کردووە!
دلەی پڕکولی هەژارم
گیانی بێ ئۆقرەوقەرارم
بەمەرگی تۆ باوەڕ ناکا
چۆن بێ منی لەتوێی خاکا؟
تۆیەک هۆگری مندالیم
هاوشکلی وهاوکرچ کالیم

هەمدەمی دەمانی لاویم
تەواو کاری ناتەواویم
هاوهەنگاو لەرێی خەباتا
هاوبەش لەهاتونەهاتا.
هەوالْ دلداری کوردستان
هاوپێشمەرگەی زێدپەرستان
هاوسرووود خوێن،بۆئازادی[1]
بۆرزگار بوون لەبێدادی
هاوسەنگەر دژی داگیرکەر
نامۆی خوێن مژی سەرەخەر
هاوقەتار لەدەربەدەری
بەهەژاری وخاکەسەری
هاوقەلەم هاوبیروهاوهەست
هاوزمان،هاودلْ وهاودەست
هەریەکێک بوو "هەژارهێمن"
منیش هەرتۆبووم ،تۆش هەرمن
رووحێک بووین دابەش لەدوولەش
دوولەشی ماندووی بەخت رەش
پەیمان بووبەجێم نەهێلی
وێلم نەکەی لەشوێن خێلی
باری خەم وێگرا هەلْ بگرین
دوا جاریش پێکەوە بمرین
تۆی کوردی واخاوەن بەلێن
چی تۆی کردە پەیمان شکێن

گەوی بەین وبەقات هەلبوارد
خۆت بەئاسوودەیی ئەسپارد
لاباری خەم خوا ریت لادا
ئەویشت بەمل من دادا
جارزبووی لەدونیای بێ فەڕ
دونیای پڕلەدەزبڕی وگەڕ
دونیای وڕوگێژو کاسان
گەوهەر وئەمەگ نەناسان
دونیای بازاڕی نامەردان
دونیای خەم وکولْ و دەردان
خەلەسی لەدەم هارومار
تەکیەوە لەو ژینی گەمار
ژیانی پرژانی بێ دەرمان
گەییشتیە هەوارِی هەرمان
بۆئەو کۆچەی بێ من کردت
ئەوبەشە خۆشیەی تۆبردت
زامی گیان ودلْ بەسۆیە
شین بۆخۆمە نەک بۆ تۆیە
خۆزگەبەرلەتۆ دەمردم
تۆشیوەنت بۆ دەکردم
دوور لەتۆدلْ گۆمی خوێنم
بەگازندە وەدەت دوێنم
منیش وەک تۆ قەلسم لەژیان
"بۆچت جێ هێشتم هێمن گیان"[2]

---

١ـ لێرەدا ماموستا هەژار ئیشارە بە خەباتی دوو قۆلی خۆی و هێمن ،ەکا لە دژی رژێمی دیکتاتۆری پەهلەوی.

٢ـ ئەم دێڕەی دوایی بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە سالی وەفاتی ماموستا هێمن: (١٣٦٥)

# ناسکە خان

ع. وەکیلی

ناسک کیژۆڵەیەک بوو تازە پێ دەگەیشت . وەک پنجەگوڵی سەردەمی بەهار رۆژ بە رۆژ جوان تر و لەبارتر دەبوو. سەرگۆنای ئاڵی ترووسکەی دەهات. زۆری شایی بەخۆ بوو. خودا خودای بوو زوو لەقوتابخانە بگەڕێتەوە وخۆی بگەیەنێتە بەردەمی ئاوێنەکە .

نیوەڕۆیەکی پایز لەبەر پەنجەرەی باڵەخانەکەیان دانیشتبوو سەیری ئاوێنەکەی دەکرد و پرچە زەردەکانی دادەهێنا

هەور بەری ئاسمانی گرت .ناسک هەر خەریک بوو پرچە زەردەکانی دادەهێنا. باران دەستی بە بارین کرد وئەوهەرخەریکی داهێنانی پرچی بوو. دنیا بوو بەتۆف و باو باران و ئەو هەر پرچە زەردەکانی دادەهێنا!

لەنەکاو ،پشووە بایەکی تووڕە پەنجەرەی کردەوە و ئاوێنەکەی بەرداوە خوار . ئاوێنە بوو بە دوو پارچەو ناسک گەلێک زویر وپەرێشان بوو. بۆئەوەی خەمی ئاوێنە لەبیر خۆ بەرێتەوە لە پەنجەرەکەوە سەیری دنیای دەرەوەی کرد .دیتی (بینی) بەوبارانە کۆمەڵێک منداڵ جانتایان لەبن قۆڵیان داوە و بۆ قوتابخانە دەچن. هێندێکیان بە دەنگێکی بەرز سروودێکی نیشتمانییان دەگوت کە ناسک لەواژەکانی حاڵی نەدەبوو .حەماڵێکی مەیلەوپیر عارەبانەیەکی پڕ لە بۆتڵەغازی (بوتری نوشابە) بە دوای خۆدا رادەکێشا . سەیرە بەو سەرمایە "غاز" بۆ خەڵک دەبا!لەوبەر شەقامەکە جەماوەرێکی زۆر لە بن چەتری چاوەروانی پاس " ئوتوبوس) راوەستابوون. هێندێکیان ژن بوون . دوو منداڵیشیان بەباوەشەوە بوو پاسێکی سپی وەدەر کەوت ، جەماوەر خۆیان بۆ کوتا و لەبەر چاوان ون بوون .

ئەوجار ناسک سەری هەڵبڕی ورووانیە دوور .ڕێزە شاخەکان ،لوتکەبەردینەکان هەڵمێکی سووکیان لێ هەڵدەستا . لە هێندێک جێ پەڵەمژێک کەوتبووە باوەشی چیاکان . ناسک لە دڵی خۆیدا گوتی :

ئای چەند جوانە ئەو هەورو هەڵمە نەرمە دەڵێی لۆکەیە !

بەڵام بەشێکی تری ڕێزە چیاکان لە تەم و مژدا شاردرابوونەوە. جار جار کەڵێنێک لەو هەورانە دەکەوت وتیشکی رۆژ لە هێندێ لوتکەی بەرزی دەداو رووناکی دەکردنەوە. ناسک چاوی بەوە کەوت وگوتی :

" ئاخ ئەم لوتکە شاخانە بۆ هێندە دڵ بزوێنن ! دەڵێی هەڵاوەسراون. دەڵێی گوارەی زێڕن بە گوێی ئاسماندا کراون !

لەودەمەدا دایکی

ناسک هاتەژوور وگوتی :
ـ ناسک گیان من بە
چێشت لێنانەوە زۆر ماندوو
بووم. تۆ ژوورەکان
هەڵوێژێرە.
ناسک گوتی :
ـ بەچاوان دایەگیان .
لەو رۆژەوە ناسک
یارمەتی دایکی دەدا و لە
جیاتی ئەوەی بەرامبەر بە
ئاوێنەکە دابنیشێ و لە
پەنجەرەوە بڕوانێتەدەورو،
بەر وسەیری جیهان بکا ، بە
خۆشی یەوە کاران دەکا و
سەرنج دەدا شت فێر بێ .
وردە وردە زۆر شتی زانی و
ناسی .منداڵ و ژن وکرێکار
لادێیی و هەموو خەڵکی
وڵاتەکەی ناسی .زانی ژیان
چەند گەورە وهەراوەوچەند
قورسیشە! زانی وڵاتەکەی
چەندە مەزن و جوان و چەند
دواکەوتووشە ! نرخی کاتی
زانی ،یا کاری دەکرد یا
گۆوار و کتێبی دەخوێندەوە
بەیانی یەک ئاوێنە بە
ناسکی گوت :
ـ ناسکەخان(خانم) من
لێت زوێرم (زیزم)
ناسک گوتی :
ـ بۆچی ئاوێنەکەم .من
چیم کردووە ؟
ئاوێنە گوتی :
ـ بۆچی وەک جاران
رۆژێ چەندجاران بەرامبەرم
دانانیشی وسەیری نەمامی
بەژن وباڵاکەت ناکەی ؟ "

ناسک گوتی :
ـ ئاخر چ سوودێکی هەیە
من کاتی خۆم بەدیار تۆوە
بکوژم .من دەمەوێ بخوێنم و
سەرکەوم دەمەوێ شت فێر بم
یارمەتی دایک و باوکم و
هاووڵاتی یەکانم بدەم.
ئاوێنە گوتی :
ـ تۆجوانی و ئەوەندەش
بۆتۆ بەسە. جوانی هەموو
شتە !
ناسک گوتی :
ـ ئاخر تۆ هەر وێنەی
خۆمم نیشان دەدەی. فێر ی
خۆپەرەستیم دەکەی ،خۆ ژیان
هەر من نیم ! ئەی دایک و
خوشک وبراکانم ؟ ئەی هاو-
رێ کانم ؟ ئەگەر من هەرتۆ
بناسم ناتوانم لە خۆم
بەولاوە کەس بناسم "
ئاوێنە گوتی :
ـ ناسکەخان تۆ جوانی و
منیش یارمەتیت دەدەم.
جوان ترین کوڕیش حەز لەو
جوانی یەت دەکەن .
ـ ئاخر تۆ هەر جوانی
دەموچاو وروالەت دەنوێنی.
ئەی جوانی دڵ و دەروون ؟
ئەی جوانی بیرکردنەوە ؟
ئاوێنە گوتی :
ـ دڵ ودەروون و هۆشی
چی ؟ کوڕان هەر حەز لە
جوانی رواڵەت ودەم و چاو
دەکەن .تۆش ئەوەت هەیە .
ناسک گوتی :
ـ ئەو کوڕانە هەرزەکار
و خۆپەرست وبێ ئەزموونن.

ئاوێنەگیان ئەو کیژانەی
تەنیا جوانی رواڵەت و
سووڕەتیان هەیە وەک تۆ
ساف و ساویلکەن وبەپشووە
بایەک دەشکێن . تۆ ئێستا
بوویە دوو لەت . دەتوانی
ببیەوە ئاوێنەکەی جاران ؟
ئاوێنە گوتی :
ـ نا !
ناسک گوتی :
ـ ئەگەر منیش تێ نەگەم
و هۆش وبیرم دەکار نەکەم
بە پشووە بای هەڵەیەک.
دەشکێم ، ئەوسا برینێکی
گەورە دەکەوێتە ژیانمەوە
وبۆم سارێژ ناکرێتەوە
پێت خۆشە بشکێم وخۆنەگرمەوە
ئاوێنە گوتی :
ـ ناسکەگیان . بمبوورە
من خۆپەرستم . دەمەوێ تۆ
هەر بۆمن بی ، دەمەوێ
چاوی بینین (دیتن) وگوێی
بیستن وزبانی گوتن وهۆشی
فێربوونت لە سینگمداحەبس
کەم .بەڵام تۆ مرۆڤی ، تۆ
زۆر گەورەی ، تۆ لە مندا
جێت نابێتەوە .تۆ دەتوانی
ئەم جیهانە گەورە بناسی.
تێی بگەی ،بیگۆڕی ، بەڵام
من پارچە شووشەیەکم. نە
دەتوانم بیربکەمەوە. نە
دڵم هەیە ونە هەست ."
ناسک دەستی کرد بە
پێکەنین و زۆر دڵخۆش بوو
کە ئاوێنەکەی بەزاندووە و
لەخۆ پەسندی و خۆپەرستی
رزگار بووە .

شاعیری ناودارونەمری کورد ، جگەر خوێن یەکێکە لەو شاعیرانەی کەخزمەتی زۆری بە زمان وئەدەبی میللەتەکەمان کردووە ، بەرهەمی چاکی پێشکەش گەل وولاّتی کردووە ، لەمڕێ یەدا بەسەرهەزاران کۆسپدا هەنگاوی ناوە هەتا دوایی ترپەی دلّی تێکۆشاوە هەرلەسەرەتای ژیانەوە ئەویندار ی گەل ونیشتمانی خۆی بووە وکوێرەوەری وەدەربەدەری زۆری دیوەهەموو کوردستان گەڕاوە . ولەدەشت وچیاوکانی وهەواردا هەست و سۆزی وەکولێ هاتووە وهاواری کردووە :

**دلبەرجوان وشرین وڕندە**
**شۆخ وشەپالەبەژن بلندە**
**سەری گهایە بەرتا جێ گەردوون**
**ل سەرسەرێ وێ تا جا فەرەیدوون**
**ب ژێردە بەردان گولی ورەش**
**بسک .**

**کراس بهارە سۆروزەرو کەسک**
**دوڕوجەواهر ژێ دێنەخوەش روو**
**کەڤانێ بەهرام چوبینەئەبروو**
**هێستر ژچاوان جۆبارو رووبار**
**ل سەرمەبگری نالین وهاوار**

جگەرخوێن ناوی " شێخ مووس"ە وباوکیشی ناوی "حەسەن"ە . سالّی ۱۹۰۳ میلادی لەگوندی "حەسار" سەربە بازێڕی ماردین لەکوردستانی تورکیا هاتۆتە دونیا .هێشتا منداڵ بووە کەباوکی چووە بەر رەحمەتی خوا . سالّی ۱۹۱۴ میلادی کە شەڕی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد ،کوردستا ـ نی باکووروباکووری رۆژهەلاّت بووبە چەپەرەکانی شەڕی نێوان عوسمانی ورووس لەبەر ئەوشەڕە قاتی وکولپ لە سەرانسەری کوردستان دەکەوێ .بەشێکی زۆر لە . کوردان نیشتمان وزێدیان بەجێ دێلّن وبەرەو جەنووب و جەنووبی رۆژاوایی کوردستان هەلّدێن، کورد بەم سالّی هەلاّتن وبرسیەتی، سالّی قوت و بڕو کوشت وکوشتار ،" سالّی سەفەر بەگلک " دەلّێن. تا

ئێستاش پیرەپیاوان وپیرە ژنانی کەئەو کارەساتەیان بەچاو دیوە ناوی " بشێری" و "دەشتی حەران "یان لەبیر ماوە. ماڵی " جگەرخوێن"یش لەو هەڵاتنە بێ بەش نەبوون ئەوانیش ئاوایی " حەسار" بەجێ دێڵن ولە گوندی " ئامۆدی" لەکوردستانی سووریا نیشتەجێ دەبن.بەشێکی زۆر لەکوردانی راکردوولەبەر گەرمای بەتینی ناوچەکانی " حەران" و"بشێری " لەنێو دەچن. دەگێڕنەوە لەوناوچانە ـ دا بایەک بەناوی"بای سام" دەهات کەدەبوو بەهۆی مردن ولەنێو چوونی رەوەندەکان. دایکی " جگەر خوێن"یش وەبەر ئەو بایە دەکەوێ و دەچێتەبەرڕەحمەتی خوا وجگەرخوێن هەر یەکجار هەتیوو سێوی دەمێنێتەوە. مردنی دایکی تەئسیرێکی زۆری لەسەردادەنێ.

جگەرخوێن وەک تەواوی منالەکانی ئەوسەردەمەی کوردستان خوێندنێکی تەکوزو بەردەوامی نەبووە ، لەهەر شوێنە شتێک فێربووە ،لەکن هێندێک مەلا دەرسی مەلایەتی خوێندووەو بەفەقێیەتی زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوەبەشی زۆری دەرسەکانی لەلاجانی خانێ لەکوردستانی ئێراندا خوێندووە .پاشان گەڕاوەتەوە بۆ کوردستانی تورکیا ولە گوندی "تێل شیر"ی لەکن مەلا "سەیداعوبەیدوڵا" دەرسی خوێندووەولەکن برای ئەو مەلا فەتحوڵا ئیجازەنامەی مەلایەتی وەرگرتووەوبووەتە مەلا. تاساڵی ١٩٢٤ میلادی لە کوردستانی تورکیادا شۆڕشێک بە سەرۆکایەتی شێخ سەعید دەست پێدەکا . مامۆستاش لەو شۆڕشەدا هاوبەش دەبێ وهەر ئەوسا بەهۆی شیعری نیشتمانی دەبێتە شاعیرێکی بەناو بانگ ،بەڵام ئەوشۆڕشە بە کوشت وبڕی کورد تووشی شکەست دەبێ. "جگەرخوێن"یش کەئەوسا سەرەتەنیا بووە دەگەڕێتەوە زێدەکەی خۆی " گوندی حەسار"ولەوێ لەساڵی ١٩٢٨ لەو دێیەدا ژن دێنێ وبەرەوکوردستانی سووریا ، دگەڕێتەوە ولەوێ دەبێتەمەلای گوندەکانی کوردستان، بەڵام مامۆستا هەرلەسەر نووسین و شێعر گۆتنی نیشتمانی بەردەوام بووە بەرەبەرەبیرو باوەڕی پێشکەوتوولەشیعرێدا سەرهەڵدەدا . بەگشتی شێعرەکانی باسی میللەتی هەژار وبندەست ، زۆرداری و دەرەبەگایەتی دەکا .بەرامبەر دوژمن وکۆڵەداران رادەوەستا وەدەیگۆت :" ئەزدکم بڤی شووری سەرێ وە ژێکم."سەیدا دەردی ژاری وپەریشانی و بەلەنگازی بەکیان ودڵ هەست پێدەکرد. میللەتی مێرخاس و کەونارای دەدی کەپەست و بندەستن وژیانیان ژانە . هەر بۆیە ناسناوی " جگەرخوێن"ی بۆ خۆهەڵبژاردووە ـ هەمیشە بەدەنگی بەرزوبانگی بڵێند وبوێرانەی کۆمەڵی هەژار وبێ دەستانی بۆ وشیاری و رزگاری گازدەکرد، بەتایبەت رووی دەکردە پیاوانی دوارۆژو دەیگوت :

## وەلاتێ من :

**وەلاتێ من تویی، بووکا جهانی**
**هەمی باغ وبهەشت ومێرگ وکانی**
**شەپاڵ وشەنگ وشۆخ ونازو گولڕوو**
**گەلەک شیرین ورند وپڕ جوانی**
**سەری تاجا سەلاحەدینی کوردی**
**ئەنی رۆژا دبورجا ئاسمانی**
**دوبرییێن تەکەوانێ روستەمێ زال**
**دو زولفێن تەژتیرێن قەهرەمانی**
**روویێ تەئاگرێ زەردەشت ومەزدەک بخوێنە ببینە مروڤێن شیار**
**ژتە هێسر شەرابا کامرانی جهان سەرستێرا ن تەنێ بەندەوار**
**دوچاوێ تەوەکی دەریای هورمز خاندن نەبە کەس ناچە پێش**
**کەپۆ ئالماسە کارێ مووش و وانی پەیدا دبن پردەردوئێش**
**دولێوێن تە کتێبا حاجی قادر هەردەم دبن دەستێ نەیار**
**زمانێ تە ژبەندا شێخێ خانی ئەم دێ بدن خۆلی وبێش**

لەشۆڕشی ١٤ تەمووز لە عێراق خۆی گەیاندە ئەوێ ساڵی ١٩٦١ تا ١٩٦٣ لەزانستگەی بەغدا بەشی کوردی مامۆستای

زمان وفەرهەنگی کوردی بووەو کتێبێکی بەناوی " ئاڤاودە ستوورا زمانی کوردی" وفەرهە - نگێکی بەناوی"فەرهەنگا کوردی" نووسیوە . ساڵی ١٩٦٩و ١٩٧٠ لەریزی شۆڕشیکوردستانی ئێراقدا بوو . پاشان گەڕایەوە سووریە ولەساڵی ١٩٧٣ بۆچاپکردنی دیوانی خۆی (کیمەئەز) چوەبۆلوبنان هەتا ١٩٧٥ لەوێ مایەوە . پاشان گەڕایەوە سووریە تا هاوینی ١٩٧٨ لەقامیشلی بوو. ئینجا بەچاپکردنی دیوانەکەی چووە سوئێدوچوار کتێبی لەوێ چاپکرد.ئەمەش بەرهەمەکانی جگەرخوێنە :

١- دیوانا یەکان شام ١٩٤٥

٢- سەورا ئازادی شام ١٩٥٤

٣- کیمە ئەز ؟بیروت ١٩٧٣

٤- روناک ستوکهۆلم ١٩٨٠

٥- زەندئاڤێستا ستوکهۆلم ١٩٨١

٦- شەفەق ستوکهۆلم ١٩٨٢

٧- هیڤی ستوکهۆلم ١٩٨٣

هەروەها سالار ومیدیا کە کورتە چیرۆکە وبە شێوەیشێعر بڵاوی کردۆتەوە بیروت ١٩٧٣، جگەلەمانە کەشێعرن، چەن بەرهەمی دیکەش بڵاوبۆتەوە کە ئەمانەن :

جمو گول پەری - چیرۆک شام ١٩٤٧

رەشۆیێ دارێ چیرۆک شام ١٩٥٦،

گوتنێن پێشیا - ( پەندی پێشنیان) شام ١٩٥٨

ئاڤاو دەستوورا زمانی کوردی(رێزمان) بەغدا ١٩٦١

فەرهەنگا کوردی١و٢- بەغدا ١٩٦٢،

ئەمسێ کتێبەشی وەرگێڕاوە - تە سەرزمانی کوردی **رقەبەری لەسەر- کوردستان ئاخەلفین - پەرتووکی کوردان وچیرۆکێکی فارسی،** ئەمانە و دەیان وتار وشێعری دیکەی لەرۆژنامە وگۆڤارە کوردیە - کاندا بڵاو کراوەتەوە،.

شیعرەکانی جگەرخوێن لە زۆر بابەتان دەدوێن زۆربەی باسی کۆمەڵایەتی ونیشتمان وئاشتی وئازادی وبرایەتی گەلان دەکا . شیعرەکانیسەرەتا بەشێوە کلاسیک وبەناوەرۆک نیشتمانی ورۆمانتیک بوون پاش شەڕی جیهانی دووهەم شێعری ئەمیش وەک هی زۆربەی شاعرانی کورد گۆڕانی بەسەر داهات .ئەڵبەت بەشێوەکەمتر گۆڕان بەڵام بەناوەرۆک بیرو باوەڕی نەوەی پاش شەڕبەسەر شیعریدا زاڵ بوو.

هەروەکوو پرۆفسۆرقەناتی کوردو لەپێشەکی " زەند و ئاڤێستا " نووسیویە :" جگەر خوێن لەریێ خۆیدا بەئەفراندنی خۆی بەحرێکی پان وبێ بن بوو گەلێ گرانە هەرمرۆڤێک لەو بەحرەیدا مەلە بکا . ئەوە کەسێکی دەوێ مەلەوان وپسپۆربێ مرۆی پسپۆر وشارەزا نەبێ کەس ناتوانێ دوڕ وگەوهەری نووسینەکانی مامۆستا بزانێ، مرۆ تەنێ دەتوانێ بڵێ کە جگەرخوێن ئۆستای شێعر و نووسەری زمانی کوردی بووەو شێعرەکانی بەناوبانگن وبۆ کورد وکوردستانی نووسیوە و دژی ئەمپریالیزمودا گیرکەر بووە."

جگەرخوێن لەو کاتەوە نیشتمانی جوانی خۆی بەجێ هێشت وتەرەی وڵاتانی بێگانە بوو.هەمیشە ئاواتوداخوازی خلاسی وگەڕانەوەی بوو، کە دەیگۆت :

**مەبێژن سەیدا جگەرخوێن بوویە کاڵ**

**دڤێ بمینم هەتادلبەر ببینم**

بەڵام داخێکی گرانەوە ئەم ئاواتەی وەدی نەهات وئاخریش لە٨٤/١٠/٢٢ لەوڵاتی غەریبایە - تی (ستوکهۆلمی سوئێد)پاش ٨١ سال کوێرەوەری و دەربەدەری وجگەرخوێنی،دڵی گەرموبەسۆزی لەلێدان کەوت وسەری نایەوە . هەرلەسەر وەسیەتی خۆی، جەنازەکەی برایەوە بۆقامیشلی وئەسپاردەی خاکی وڵاتەکەی کرا .

رۆژی ١٩٨٤/١١/٥ نەتەنیا خەڵکی شار بەڵکوو دەیان هەزار کەس لەدوور ونزیکەوە چووبوونە پێشوازی جەنازەکەی وهەموویەک دەنگ هاواریان دەکرد :" جگەرخوێن نامریت ئەوی سەیدا "

# کەوشی بلە...!

ع: میهەن توور

شەوێکی فێنکی پایز بۆ گەڕان چوومە نێو شار. منداڵ لە کووچەوکۆڵانی شار خەریکی کایە وهەڵبەز هەڵبەز بوون. گەورەش وردەوردە دەهاتنەدەر. چرای شەقام تاریکی تاراندبوو شار هەرتروسکەی دەهات.

لەسەر کووچەیەک چەند منداڵ هاواریان دەکرد.

ـ بلە! دزە! بلە! دزە

لەپێشدا وامزانی ئەوەش جۆرەکایەکی منداڵانەیەچون، منداڵی ئێمە مانان هەرکە قسەیەکیان کەوتەبەرزار پێی هەڵدەبەزن وماوەیەک خۆی پێوە دەغافڵێنن بەڵام هەرکە وەڵامی ئەمقسەمبیست سەرنجی بۆلای خۆ راکێشام.

مێرمنداڵێکی لاواز لە وەڵامی ئەممنداڵانەدا دەیگوت:

ـ بەخودای من دزنیم!

منداڵێکی خرپنەی تووش لێی چووەپێش وگوتی:

ـ ئەی باشە ئەگەر دزنی ئەم کەوشەتازانەت لەکوێ بوو؟

یەکی دیکەلەولارا هەڵیدایە وگوتی:

ـ بابە دەوڵەمەندەکەی بۆی کڕیوە!

ئیدی بەمقسەهەموولەقاقای پێکەنینیان دا

کوڕە وەجواب هات وگوتی:

ـ وەڵڵاهی نەمدزیون! کڕیومە! بەئێوەچی؟

دیسان منداڵەخرپنەکە سینگی رەپێش خست وگوتی:

ـ دزیش دەکەی، درۆش دەکەی؟ ئاخر هەتیوە ئەتۆ ئەگەر پوولت هەبوو کەوشی بریقەدار وجوان بکڕی، بۆچی کراسێکت نەدەکڕی؟کراسەکەی بەرت دەڵێی گجوولە کایەیان پێکردووە!

دیسان منداڵ وەپێکەنین کەوتن ودەستیان کردەوەبە بلەدز! بنەدز!

کوڕەکە کەئەوجار لێم حاڵی بوو ناوی بلەیەگوتی:

ـ ئەرێ ئەنگۆ دەڵێن چی؟ کەیفی خۆمنیە؟ کراسی ناکڕم کەوشی دەکڕم!

ـ جائەمە بۆتۆمانە بەدبەخت. رەق هەڵدێی هەموو لەشت بەدەرەوە. چاولەگۆشتی سەرشانت بکە دەڵێی قایشی هەمەدانە!

ـ خوداش بەشی منی واداوە زۆرشوکر!

ـ ئای! ئای! هەتیوە دزە چۆن باسی خودا دەکەی.

ئەتۆ دزی ! ھەر ئێستا ھەڵێ ئەم کەوشانەت لەکوێ ھێناوە ، بەرەلەجێی خۆی دانێوە!

یەکی دیکەھاواری کرد :

— جاخودا لەوەخراپترچی لێ بکا ؟

— کورە ئاخربۆپێتان وایە من دزم؟ تائێستاچتان پێوە دیوم؟

— ئای!ئای ! کورەشەرمبکە لەبیرتەپێرار لەبەر دوکانی میرزا قاسمی مات ببووی! پاشتاوێک پرتدا ھەنارێک وەھەڵاتی ! ئەویش زوو رێت کەوت ولێی ستاندیەوە ! ئەتۆش گریای ونازانم چت پێگوت ئەویش دەستی گرتیو ھێنایەوە دوکان وپاکەتێکی ھەناردایەی!

— بەدی ! خۆحاشاناکەم! خوشکم نەخۆش بوو ،بابیشم پوولی نەبوو بۆی بکڕێ . منیش ھەر تمەنێکم پێ بوو میرزاقاسمیش بایی تمەنێکی ھەنار پێ نەفرۆشتم دوایە ،حاڵیمکرد ئەویش پاکەتێکی ھەناردا مێ

منداڵ وێکرا لێیان لە ھەڵڵادا ودیسان بلەدزە! بلە دزە!دەستی پێکردەوە زۆرسەیر بوو! لەتاوئەوکورە جەرگم جەرگی دەخواردەوە بەڵام ھیچم لەدەست نەدەھات . لەلایەک زگم بەھەژاری ئەوکورە دەسووتا ولەلایەک لێی ناڕەحەت بووم کەبۆدەبێ کەوش بدزێ . ئێمە ھەژارمان زۆر دیتوون بەڵام سەرەرای ھەژاری ئەگەر شەو برسی وتوونی سەربنێنەوە ، ئامادەنین وەھا کارێک بکەن! جاچۆن دەبێ دایک وباب منداڵ ئاوا باربێنن کە لەبن سەوەتەوە فێری لارێ یی و دزی ببێ .

وردەوردە چوومەپێش . بلە ھەرکە چاوی بەمن کەوت،شڵەژا گوتم :

— کوڕە چت دزیوە؟

— کاکە بەخودای ھیچم نەدزیوە. ئەوانە درۆدەکەن لە خۆڕا بەتەمان وام بەسەتۆدا بێنن . پێیان وایەمن ئەو کەوشانەم دزیوە

چاوم بەلاقی کەوت جووتێک کەوشی رەشی بریقەداری دەنواند چاوێکم لێکرد ورووم لەبلەکردەوەوگوتم :

— ئەدی لەکوێت بوو . بلە؟

پێت ناڵێم کاکە! ... پێت ناڵێم .

ئیدی چاوم عەرزی نەدی گوێم گرت وگوتم :

— ئەگەر راستی نەڵێی پیس دەبینی

بلەگوتی :

— کاکە وامزانی لەسەرم دەکەیەوە. ئەتووش باوەڕم پێ ناکەی؟

— ئاخر کوڕە ئەتۆ دزیشت کردووە ، ھاواریش دەکەی ؟ راستێ بڵێ وخۆت خەلاس کە! برا گیان دزی خراپە! بۆخۆت نازانی ؟

— با،زۆرباش دەزانم بەڵام بەخودای دزیم نەکردووە بە قەبری دایکم بەگیانی بابم دزیم نەکردووە !

— باشە وەرە ماڵەکەتانم پێشان بدە بابزانم بابت کێیە ؟

— بابم نیە ؟.....

وامزانی ئەومش ھەردرۆیە چون زۆرجاران بەمنداڵی من بۆخۆم شووشەم دەشکاند یاتڵتە باینجانم بەخەڵک دادەدادوایە ئەگەر دەیانگرتم دەمگوت بابم نیە وسەغیرم . دڵیان نەدەھات لێم بدەن . بەرەڵڵایان دەکردم . گوتم :

— دایکت چی ؟

— وەڵڵاھی دایکشم نەماوە تەنیا من وخوشکەکەمین .دادە ھەمینم لەمن گەورەترەکەسی دیکەشمان نیە!

وەختبوو ئاگر بگرم نەمدەزانی درۆدەکا یاراست. بۆڵێک نەدەبۆوە . بەڵام ئاخر ئەم ھەموو درۆیە دەبێ؟

ھێندێک تێی رامامتەمەشام کرد کیژۆڵەیەکی جوانکەڵە لە دوورەوە دەھات . بلەگوتی:

— ئەوەخوشکمە ھیچی پێ مەڵێ ! بۆوەی بیترسێنم گوتم :

— بەرێ وەڵڵا ھەمووشتی پێدەڵێم . خوشکی ھاتەپێش و بێ ئەوەکەسلاو بکا رووی لە براکەی کرد وگوتی:

— ئافەرین بلەئەوە بە قسەت کردم ئاوا بەقسەی خوشکی خۆت دەکەی؟ حەیاناکەی دزی دەکەی؟ ئەوکەوشەت لەکوێ بوو؟ زووھەستە بیدەوەبەسێحە

– بێ .

بلە دەستی بەگریان کرد . منداڵ دەورەیان دابووین کەس متەقی لەبەر نەدەهات . کیژە کەگوتی :

– کاکە ئەوکەوشانە ئی تۆن؟

– ناوەڵڵا خوشکم! من ڕێبوارم ئاگام لەهیچ نەبوو بێرەدا رادەبردم . لەپڕدیتم هەڵلا یەوهاتمە پێش .

کیژەکە بێ ئەوە چاوی لە من بێ رووی لەمنداڵان کردو گوتی:

– چتان دەوێ بۆ وەک شڵغەمێش دەورەو داوین .

منداڵ سەریان بەرداوە و یەک دووهەنگاو دوورکەوتنەوە. بەڵام بەیەکجاری ئەوێیان بەجێ نەهێشت.کیژە رووی لە بلە کردوگوتی :

– تازە خوشکت نابم . هەر کوێ یەک دەچی بچۆ .کارت بە من نەبێ . من برای دزم ناوێ !

ئەوجار دەستی کردبەگریان وگوتی:

خودا دایک وباب وبرای پێوەرەوا نەدیتم وهەمووی لێ ستاندم تەنیا تۆ ماوی! تۆش دزی دەکەی؟ بریا تۆش نەمابای بەڵام دزیت نەکرد- بایە !

بلە خۆی پێ رانەگیرا بەگریانەوە گوتی:

– چون دادە تۆش پێت وایە دزم؟

– ئەدی دزنی چی ؟ ئەو کەوشانەت لەکوێ بووە ؟

– کوا کەوش ؟

– ئەوەتا ! دەی بڵێ کەوشیشم نەدیوە . حەتمەن بۆخۆی هاتووە! براقەتم نەدیوەکاری وابکەی؟ ئەوەچیە ؟

– کچێ دادە کوا کەوش؟ ماڵتە ئێوە هەمووتان کوێرن

تێکرد ودەلاقم هەڵسوو . ئاخر دوێنێ شەو پێخواس بووم . منداڵە وردکە هەراسیان بە روحی هەڵگرتم گوتم بالاقلم رەنگ بکەم بەڵکوو وابزانن کەوشم هەیە ودەستم لێ هەڵ بگرن .

بەم قسە هەمووسەیری لاقی بلەمان کرد دەتگوت لە شتێکی شاراوە دەگەڕێین دیتمان راست دەکا لاقی رەنگ کردووە . خۆکەوش نیە! تەنیا تاوێکی ئێمەی هەڵخەڵەتاندووە بلە درێژەی بەقسەداوگوتی

– ئێوارە میرزاجەلیلی پینەچی شووشەی بەتاڵی جەوهەری کەو - نی فڕێدا منیش هەڵم گرتەوە وچۆڕێکم ئاو

بەراستی شەرمم کردئەوان منداڵ بوون ونەیاندەدیت خۆمن گەورە بووم . دەبادیبام ئەی بۆچی گوێچکەی ئەم منداڵە گرت وبامدا ؟

بەشەرمەساری یەوە سەرم بەرداوەوکۆڵانەکەم بەجێ هێشت هیچم پێ نەدەگوترا تەنیا رووم لەئاسمان کردو گوتم :

– خودا یە هەڵی نەگری !!

# ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی

# زەنبیل فرۆش

جا دەڵێ زۆری لەوموناجاتە کرد ولەوێڕا خۆی فڕێ دا خوارێ ئەگەر خۆی فڕێدا خوارێ وادەگێڕنەوە وەکوو کەمەندێکی دەنێمو قەدی خەی بەو ئەندازەی کەوتە سەر زەمینەوە ...وە بۆماڵێ ،وەختێکی کە گوڵ فەتەکەی گەڕاوە هاتەوە کن خاتوونێ .خاتوون کوتی :

ماشووقی منت چ لێ کرد .

کوتی :

خاتوونە بەرگی نوێت لێ موبارەک بێ .ئەوپیاوە دەستی کرد بە موناجات لەبەر خودای پاڕاوە ئەمن لەوێ ڕاوەستابووم لەسەر ئەو باڵەخانەی ڕا خۆی فڕێدا خوارێ.وەڵڵاهی لەخوارێ بەچاوی خۆم دیتم هیچی لێ نەهات .ڕۆیشتەوە بۆماڵێ .

جادەڵێ ئەگەر زەنبیل فرۆش ڕۆیشتەوە ماڵێ ،چۆوە بە خێزانی کوت :

برۆ بۆسەرا پەردەی خاتوونەی زەنبیلەکانم لەوێن هەرچەندەی گێڕایەوە دانەی پاردەشاییە ئەگەر هیچی نەگێڕاوە، بیان هێنە و وەرەوە .

دەڵێ وەختێکی خێزانی زەنبیل فرۆش ئەگەر هاتە کن خاتوونەی،خاتوونە لەوێ چاوی پێکەوت کە ئەوە خێزانی زەنبیل فرۆشە چەنگێکی زێڕ دەکۆشی کرد و ژنی زەنبیل فرۆش لەخۆشیان هاتەوە بۆماڵێ .

ئەگەر هاتەوە کن زەنبیل فرۆشی کوتی : ئەوە چیە لە کۆشت دایە ؟

کوتی :

وەڵڵا خاتوونە چەنگێکی زێڕ

داوەتێ.

کوتی : داوەرە پێشێ، کە وەختێکی لێی چووە پێشێ ،دەڵێ ئەگەرفووی پێداکردن هەموو بوون بە زەرگەتە وژەنگەسوورە بەسەر وگوێلاکیانەوەدا ، هەموو دەموچاوی هەستا .

کوتی مەعزی ڕەزای خودای زەنبیل فرۆش بۆم وەکوو خۆی لێ بکەوە تاکوو بیان بەمەوە، بۆ خاتوونەی .

جا وا دەگێڕنەوە دەڵێ فووی پێداکردن بوونەوە زێڕ و بردنیەوە بۆ خاتوونەی ئەگەر چووە کن خاتوونەی ،

خاتوونە تەماشای کرد هەموو دەم وچاوی ئەستوور ببوو

کوتی ئەوە چت لێ بەسەر هاتووە

کوتی خاتوونە وڵڵاهی کە فووی پێداکردن بە جارەکی بوون بە زەرگەتە وژەنگەسوورە هێندیان پێوەداوم ئەوەهەموو بۆیە وا دەموچاوی من وای لێ هاتووە.

جا کوتی ئەگەرواتێ ئەوە پیاوی خودایە ،ئەتۆش زەعیفە هەڵبەتە هەوەڵێ خانم بوویە ئەگەر ئەتۆ ئەلحانەکانێ بەو ئەندازەی ڕەفتارێ بکەی تاقەت نایەتێ ئەتۆ پێم لەکن مەبرە ئاموشۆیە بکە وەرەکنم ئەمنیش لە هەموو شتێکی مولاحەزەت دەکەم.

دەڵێ خێزانی زەنبیل فرۆش فریوی خوارد، دە حەفتەیدا جارێک دوو جار سێ جاران دەچووە کن خاتوونەی هەتا وای لێ کرد دڵی نەرم کرد .

کوتی چ شەوێکی ئەگەر زەنبیل فرۆش دەگەڵە تۆجەمع دەبێ پێم بڵێ . کوتی هەر شەوی جومعانە . شەوی جومعانە بە درەنگەوە ئەگەر زەنبیل فرۆش هاتەوە ئەمن گۆزەڵێکی ئاو بۆ لەسەر کورسی دادەنێم نانێکی ڕەقی بۆدادەنێم ،نانە ڕەقەکەی دەخواو دەگەڵم دێتە دەجێیەوە.

دەڵێ ڕۆژێکی قەراروبریاری دانا بەو ئەندازەی کە پێی کوتبوو لیباسەکانیان هەموو گۆڕیوە فەقەت خاتوونە لەخۆشیان لەبیری چوو ئەگەر بازنە وخڕخاڵی لە دەستی دەربێنێ،پاوانەی هەر دەلاقی دابوو.

بەڵێ دەڵێ بەوتەرتیبەی کە پێی کوتبوو هەمووی ئەنجام دا کە شەوێ دەگەڵی چوو دە جێگایەوە دەستی وەباسکی کەوت ئەوە بازنەی تێدایە ، خڕخاڵی تێدایە، ئەگەر لاقی درێژ کرد لاقی وەلاقی کەوت تەماشا دەکا ئەوە پاوانەی تێدایە دەڵێ فکری لێ پەیدا بوو پیاوی خودای لەخەراپەی بەدوورن .

کوتی یا ڕەبەنا دەبێ خاتوون ئەو عەیبەی لە من نەکردبێ مەرتەقی لە خۆی بڕیبوو خاتوونە هیچ دەنگی نەدەکرد .ئیدی هەرخێرایەکی لاقی بەعەرزی داداو هەڵات .

ئەگەر هەڵات بۆدەرێ لەپشتەوە ـ ڕا وادەگێڕنەوە دەڵێن شاقەلی پچڕی کەوتە سەری بە نێو شاریدا هەتا لە شاری هێنا دەرێ . دەڵێ چوار ڕێیانەک بوو لەچوارڕێیانەکە بەئیرادەی خودای لەپێش چاوی ون بوو.جا بەعەزێک دەڵێن عەرز قەڵەشیوەتەوە و چۆتە تێوی.ئەمن دەوێدا نازانم ئەمن وام بیستووە لەوێ لە پێش چاوی ون بووە.

ئەگەر لەپێش چاوی ون بوو لەو جێگای خاتوونە جێ بەجێ هێنای ئەوجێگای نیشانە کردبوو سبحەینێ میعماری هێنا سەرێ. سەختوو مانێکی لێ سازکرد عیماراتێکی وای لێ سازکرد ئەگەر دەو شاری دا هەوتای نەبوو.

دەڵێ زەنبیل فرۆشیش بە ئیرادەی خودای دەسووڕاوە لە مەملەکەتی دیکە .لەمێژسالێ بوو دەگەڕا بەئەندازەیەکی وا کە وەختێکی ڕێی دەوێ کەوتەوە بۆخۆی پیر ببوو ،جائیدی خودا دەزانێ کەچەند سالی پێ چوو ئەو خاتوونەش ئەگەر ئەو عیماراتەی ساز کردبوو مەعمووری دانابوون هەر مەنزووری ئەوە بووکەزەنبیل فرۆشی وەگیر کەوێتەوە . هەر کەسێک بەوڕێگایەی دا هاتبایە ئەو مەعموورانە بە زۆری

دەیان هێنا . دەیان کوت دەبێ لادەی نانی بخۆی ،پێخوری پخۆی، تەعامی بخۆی، بڕۆی ، ئەوە بۆ خێرێ دروست کراوە .

دەڵێ وەختێکی زەنبیل فرۆش ڕێگای دەوێ کەوتەوە بەوێدا هات چاوی بەو عیمارات ودەزگایەی کەوت ،تەماشای کرد دوو مەعموور هاتنە سەر ڕێ . کوتیان کاکی ڕێبوار لادە لێرە نان وتەعامی خۆت بخۆ بڕۆ.

کوتی بابم لێم گەڕێن ئەمن ڕەفتەنیم دەڕۆم.لانادەم خوای وناخوای زۆریان لێ کرد .

کوتیان ئەتۆ لە کنە خۆ موسڵمانی ئەوە بۆ خێرییە بۆ ...بە باحیسی خێری کابرای. لابدە چۆڕەک ئاو بخۆوە نانێک تەعامێکی بخۆ بڕۆ.

بەڵێ کە وەختێکی هاتە ئەو سەراپەردەیەی. زەنبیل فرۆش چوو نانێک تەعامێک بوو خواردی. تەماشای کرد یەک نەفەر لەوێ دانیشتووە نقابی خۆی پۆشیوە ئەگەر خەلاس بوو ئەو نەفەرە رووی تێ کرد.

کوتی میوان بەخودات سوێند دەدەم ئەتۆ چت بەسەر هاتووە لە منداڵی یەوە بۆم بگێڕەوە. ئەمن نەخۆشم نجومدا-ران تەماشای نجومیان کردووە ئازارێکم لەسەرە هەرکەسێکی حەکایەتی خۆم بۆ بگێڕێتەوە ئەو نەخۆشیە لەسەر من دەفع دەبێ . ئە تۆش دەڕێی خودای بەسەرهاتەکەتم بۆبگێڕەوە.

چوون زەنبیل فرۆش پیاوی خودای بوو ،موسڵمان بوو ، هەر چی بەسەری هاتبوو لە نووکەوە بۆی گێڕاوە.

ئەگەر بۆی گێڕاوە جێ بە جێ دەستی لەیەکتر توند کرد جومگەی دەستی گرت . کوتی ئەی زەنبیل فرۆش ئەوە ئەتۆی ئەمن لە ئاسمانانم دەریستی لە عەرزیم وەتێر کەوتی .

زەنبیل فرۆش کوتی یا ئیلاهی بەس ئەمن بە جحێڵی تووشی کاری خراپ نەبووم دەبێ تازە بە پیری تووش بم ، یارەبی خودایە تۆ ڕەحمێکم پێ بکەی.

دەڵێ فکری لێ پەیدا بوو کوتی هەرچی هەیە ئەوە لە تەرەف خودایەوەیە .

کوتی خاتوونە ئەگەر ئەتۆ هەر خاتوونەی ئەگەر هەروایە بنێرە لەدووی مەلای تا مارەت کەم دیارە خودا وای ئیرادە پێ یە .

جێ بەجێ خاتوونە ناردی لە دووی ،مەلای هێنا بە عومری شەرع خۆی لێ مارە کرد ، کە وەختێکی خاتوونەی مارە کرد خاتوونە کوتی :

بەخودای ئەمن هەتا ئەتۆ لەبەر خودای بەپاڕێیەوە نەیەینەوەسەر عومری چاردە ساڵە ئەمن نایەڵم ئەتۆ بە وەسڵی من شاد بی .

جا دەڵێ وەختێکی کە زەنبیل فرۆش دوورکاتی نوێژ کرد لەبەر خودای پاڕاوە فەقەت ناردی ژنەکەی خۆشی هەر لەکن خاتوونە بوو کە لە کنە خۆی ڕاگرتبوو وهێنای .

خاتوونە وهەر سێکیان هاتنەوە سەر عەمری چاردە ساڵەی جا ئەو دەمەی بە وەسڵی شادبوو .جا وادەگێڕنەوە دەڵێن زەنبیل فرۆش بەخۆی و وبە دوو ژنانەوە ڕۆیشتن دەسووڕاوە سەیاح بوو هەر زەنبیلەی دروست دەکردن .

# مەولاناخالید

«عومەرفاروقی»

کوردستان پەروەرگای، گەورە پیاوانێکی وەکوو **سوهرەوەردی و شارەزووری و سەعید نوورسی وشێخ قەسیم و مەلای موسەنیف ونالی** ودەیان مەزن وبەرێزی ئەوتۆبوون کەهەرکامە توانیویانە بە یارمەتی خوای گەورە جێگای پێ ورەوتی خۆیان لەمێژووی ئێران وئیسلامی گەورەدا هەتا هەتایە دابنێن وئەوانە کە زمانی دڵ ودەروون دەزانن هەزاران رەحمەتیان بۆبنێرن. جالەرێزی ئەوانەدا ئێمە دەبێ لەسەرئالقەی مشایەخ و شۆرەسواری فەرهەنگ وئەدەبی ئیسلامی وکۆمەڵایەتی خوا لێ خۆش بوو **مەولانا خالیدی نەقشبەندی موجەددەدی شارەزووری** ناوبەرین....

خوێنەری بەرێز..مەیدانی عیرفان وخۆپاراستنی ولە خوا ترسان مەیدانێکی ئەوتۆ نیە کەمن وتۆبتوانین چارە- وای خەیاڵی خۆمانی تێدا لینگ بدەین وئەو بەحر وچەم ورووبارە نیە کە بتوانین مەلەی تێدا بکەین " چونکە مەیدانەکەی سوارچاکی زۆر کارئامەوبەکاری دەوێ و، گۆمەکەی مەلەوانی بەتاقەت و مەندولەسەر خۆی گەرەکە تاکوو بەئارامی رێگابگرێتە بەر وخۆلە شەپۆل وشەپڵاخە بپارێزێ.بۆیە منی بێ بەشیش لەقەراخەوە وبێ ئەوەی بوێرم ئاوقەی ئەومەیدان و گۆمەقوولەبم وەکوو لایەنگرێکی زانایانی کورد بە دڵی خۆم بەسەرهاتی عارف و زانا وشێخ ومورشید وشاعیر و خۆپاریز ومەزنی کورد مەولانا خالیدتان پێشکەش دەکەم.....

من بەیارمەتی وەرگرتن لەسێ کتێبی تاریخ مشاهیرکُرد ژینانەری زانایانی کورد گوڵزاری شاعیرانی کوردستان ئەم وتارەم بۆئێوە دەنێرم بەو هیوایە کەبتوانن کەلکی لێ وەرگرن وگەلی کورد شانازی بەوزاتەوە بکا و هەندەران وهاو وڵاتییە غەیرە کوردەکانیش ئەم زاتە وەکوو گەنجینە وخەزێنەیەکی فەرهەنگی کوردستان بناسن وبزانن هۆی سەربەرزی ئێمەیە.....

**مەولانا خالید** لەساڵی **١١٩٣**ی کۆچی مانگی لە شارۆچکەی **قەرەداغ** نزیک شاری **سولەیمانی** لەدایک بووە باوک ودایکی لەبنەماڵە گەورەکانی کوردبوون دایکی بەناوی **فاتمەخاتوون** لە. ئەولادی خوالێخۆش بوو **پیر خدری شاهۆ** وباوکی لە **هۆزی جافی میکائیل** و**مەولانا ئەحمەدی حوسێنی** ناوبوو.... خالید لەسەرەتای ژیانی خوێدالەلای ماموستایانی ئایینی کوردستان وەکوو **شێخ عەبدولڵاخرپانی ومەلاعبدالرحیم زیارتی** و **سەید عەبدولکەریم بەرزنجی مەلا سالح تەرەماری** و **مەلامحەممەد باڵەکانی** خەریکی خوێندنی عیلم وزانست دەبێ هەرلەم سەردەمەدا هەستی ناسک وجوان

وپاراو سەرانسەری دڵی پڕ کوڵی دادەگرێ وقەڵەمی دەداتە دەست وچەند پارچە شیعری جوانی داناوە کەلەوشیعرانەدا خواپەرستی وئایینی پیرۆزی ئیسلام وعیرفان خۆیان نواندووە.

**مەولانا خالید** پاش کەلک وەرگرتن لە مەحزەری ئەم ماموستا مەزنانەدا بەعەزمی وەدەست هێنانی عیلموزانستی زیاتر کوردستانی ئەودیو بەجێ دێڵێ ودێتە شاری سنە... لەم کاتەدا سنە ناوەندێکی گەورەی عیلم وئەدەبی ئیسلامی وکۆمەڵایەتی بوو وماموستایا-نی گەورەی کورد لەمزگەوتی رازاوەو شکۆداری جامیعەدا، کە**بەدارول ئیحسان** ناوبانگی دەرکردووە خەریکی دەرس گوتنەوە بوون، یەکێک لە وانە ماموستای خوالێخۆش بوو شێخ محەممەد قەسیم مەردووخی لەوێ دەرسی ریازی وهەندەسۀ نجوومی دەگوت. مەولانا ماوەیەک لەخزمەت ئەمزاتەدا لەشاری سنە کەپای تەختی دەسەڵاتداری میرەکانی ئەردەڵان بوو دەرسی خوێندو کەلکی وەرگرت تا ساڵی ۱۲۲۰ کە بۆزیارەتی مەرقەدی پێغەمبەری خودا "د-خ" بەرەوحیجاز وەرێ کەوت وسەر ئەنجام لەشاری شام بەخزمەت شێخەگەورەکانی قادری گەیشت وەکوو **شێخ مستەفا کوردی** **شێخ محەممەد کزبری** وئەمجار چووە مەدینەی منەوەرە. و مەرقەدی پێغەمبەری مەزنی ئیسلامی زیارەت کردقەسیدەیە-کی بەرز ورازاوەی فارسی بەم بۆنەوە داناوە کەیەکێک لە شیعرە تەڕوپاراوە جوانەکانی مەولانایە وبەم چەشنە دەست پێدەکا.

**عجایب نشئەای زین دامن کهسار**
**می‌آید**
**توگوئی با نسیم صبح بوی یار**
**می‌آید**
**زخاکش یافت تسکین زخمهای**
**سینهٔ ریشم**
**تعالی الله چەسان از مشک**
**این کردار می‌آید**

هەرلەمەدینە مەولاناش وەکووعەبدووڕڕەحمان حاجی شاعیر وعارفی گەورەی ئێران کەحەوت بەندیکی بە فارسی لەتاریفی پێغەمبەری خوادا گوتووە شیعرێکی هەیە بەمچەشنە.

**سرور عالم، من دلدادەوحیران**
**توام**
**واله وسرگشتهٔ سودای هجران**
**توام**
**شاه تخت قاب قوسین تو**
**من کمتر گدا**
**کی بود یارای آن گویم که**
**مهمان توام**

پێویستە بگوترێ **عەبدووالرە-حمان حاجی** بۆ خۆی یەکێک لە مورشید وشێخەگەورەکانی تەریقەی نەقشبەندی بووە و هەرلەم شیعرەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە **مەولانا خالید** چەند مایل وداخوازی **نەقشبەندی یەکان بووە....**

پاش گەڕانەوەی سەفەری حەج مەولانا لەشاری سولەیمانی خەریکی دەرس گوتنەوە دەبێ تا ساڵی ۱۲۲۴ کۆچی مانگی کە دەروێشێکی هیندی دێتە سولەیمانی ودەچێتە جەلەسەی دەرس گوتنەوەی مەولانا خالید وسەرنجی رەفتار وکرداری ئەو دەدا ولە حوجرەی مزگەوت بۆماوەیەک دەمێنێتەوە تا سەرئەنجام رۆژێک بەمەولانا دەڵێ: تۆ کەپێت ناوەتە عیرفان وتەقوا وزیارەت بۆچی ناچیتە خزمەت حەزەتی **شاە عەبدوڵڵا دێهلەوی**؟ مەولانا سەبارەت بەوشێخە پرسیاردەکا دەروێش دەڵێ: ئەوەجێگاداری شاهی نەقشبەندە وخانەقای لەشاردێهلی پایەتەختی هیندوستانە... بەم چەشنە مەولانا دەستی لە مزگەوت و خانەقا هەڵگرت وبەرەو هیندۆستان رێ کەوت ولەسەر رێگای خۆی چووە تاران و بۆستام وزیارەتی مەرقەدی شێخ وعارفی مەزنی ئێران **بایەزیدی بەستامی** کرد ولە خوا پاراوەکە.

**یارب بەآشیانەشهباز لامکان**
**یعنی بەقرب و منزلت جان**
**بایزید**
**برخالد شکسته بیچارۀ غریب**
**بگشا دری زمخزن عرفان بایزید-**

ئەمجارە بەرەوخوراسان

وشاری مەشـەدوەڕێ کـەوت و
مەرقەدی ئیمام رەزای غەریبی
زیارەت کـرد واەـویـش ،
قەسیدەیەکـی دوور ودرێژی
فارسی داناوە کـەبەم چەشنە
دەست پێدەکا

**این بارگەکیست کەاز عرش برتر است**
**وزنور گنبدش همە عالم منوراست**

ئەمجارە دەگاتە هەرات و
لەوێ بەری پێدەگرن کـە
هیندوستان ناوەندی بـوت
پەرستانە وخوانەناسانەوئەم
ڕێگا درێژە مەپێوە بەڵام ئەو
بەم چەشنە وەڵامـی ئـەوان
دەداتـەوە .

**اگرچە کافرستان است باشد از وجود او**
**بهشت واین سخن نبود خلاف نص قرآنی**
**بسی توبیخ کردند اهل توران وخراسانی**
**بەدار الکفر رفتن چون پسندی گر مسلمانی**
**بەدهلی ظلمت وکفراست گفتندو بەدل گفتم**
**بەظلمت رواگر درجستجوی آب حیوانی**

سەرئەنجام ساڵی ١٢٢٤ بـە
خزمەت شا عەبدوڵڵا دیهلـەوی
گەیشت وخەریکی وەدەست هێنانی
ڕازی نهێنی عیرفـان بـوو و
بۆماوەی ساڵ ونیوێک عیرفانی
پێوا و ئەزمـوونـی سـەخت و
دژواری بردە سەر وئـیـزن و
ئیجازەی ئیرشادی پـێـدرا و
گەڕایەوە بۆ کـوردستـان و
ماوەیەک لەشاری سنە خەریکی
تەعلیم وفێرکردن وبارهێنانی
ئۆگران وئـەویـن دارانـی
عیرفان وخوداناسـی بـوو .

پاشـان لـە
سولەیمانی وبەغدا وباقـی
ناوچەکانی کوردستان مـوریـد
وپەیرەوی لێ کۆبوون کـەئـەم
چەشنە ڕاپەڕینەبوو بەهـۆی
داچڵەکاندن ولەخەوهەڵسانی
چەندکەسێکی بەخیل ونـەزان وێ
کردەوە ونووسین وچوونـەلای
کاربەدەستانـی دەوڵـەت .
مەولانا وموریـدانیـان جەز-
رەبەدا . بەڵام ئەو بەیارمەتی
وەرگرتن لەخودا و دەریـای
بێ بنی عیرفان وکەمـاڵاتـی
خۆی هەروا بەرەوپێش دەچوو ،
ڕۆژبەڕۆژ ئاوازەی عـیـلـم و
مەعریفەتی دونیایان دەگرتـە
بەر . تا ساڵی ١٢٤٢ی کـۆچـی
مانگی کەلـە شاری دیمشق
پایەتەختی ئێستای سـووریا
کۆچی دوایی کرد ومەرقـەدی
لەوشارەدا زیارەتگای ئەویـن
- دارانی عیرفان وخۆپارێزان
ولە خواترسانە .

مەولانا خالید پترلەپانزدە
بەرگ کتێب وریسالە ونامیلکەی
نووسیوە ولەئەدەبیاتی عەرەبی
وفارسی وکوردیدا مـامۆسـتـا
ولێزان بووە وبە سێ زمـان
شیعری داناوە بەتایبـەتـی
شێوەی نـووسیـنـی لـەگـەڵ
شوێنەواری شاعیران وعارفانی
گەورەی ئێراندا بەرانبەری
دەکا

مەولانا خالید پاش مردنی
خۆی شێست وهەشت مـوریـد و
خەلیفەی گەورەی بەجێ هێشتووە
کەهەریەکەی بۆخۆیان شـۆڕە
سوارێک بـوون لـە مەیدانـی
عیرفان وخواناسیندا کەلەنا و
ئەوانەدا عارفی گەورە **شێخ
عوسمانی سیراجودینی** ئـەوەڵ
کە مامۆستای خوالێخـۆش بوو
مەولەوی کـورد بـووە و**شێخ
عەبدوالقادری شەمزینی وحاجی
عەبدوڵڵا جەلی کۆیی** بۆئێمـە
ناوێکی ئاشنان ،بەروانینی
شیعری مەولانا ئەوراستـی یـە
دەردەکەوێ کـەمـەولەوی کورد
لەشیعردا یەکێک لەشاگردانی
ئەوە **خـوا بیان بـەخـشـێ
ودەرەجەیان عالی بێ .**

**قیبلەم فیراقت، قیبلـەم فیراقت**
**ئارامم سەندەن سـەودای فیراقت**
**دڵ قـەقـنـەس ئاسان چ ئیشتیاقت**
**تاقەت تاق بیەن پەی ئەبرۆی تاقت**
**دورج قامتت قیامەت خێـزان**
**هجرت شەرارەی جەهەنـەم بێزان**
**کارێ پێم کەردەن مەحروومەی رازت**
**نەکەردەن وەدڵ نیم نیگـای نازت**
**قەدر عافیەت وەسڵت نەزانـام**
**شوکرانە شەکەر رازت نەوانام**

یاری خۆم لێ زیزە بۆیە حەز لەمانگی نەو دەکەم
شەو کە بێ هۆشم لەتاوی وامەزانە خەو دەکەم
سەرف وسوودی نەقدی دڵ لەم عالەمە بێ مایەیە
تابەکەی بێ فایدە سەرفی گەنجی کەیخوسرەو دەکەم
بۆ شکاری مورغی وەحشی نەک هەڵۆ و شاهێنم
عاشقی چاو بازی خۆمم بۆیە راوی کەو دەکەم
رۆژ بە یادی رووی هەتا ئێوارە هەر هاوارمە
شەو بەفیکری زولفی تا سبحەینێ سوحبەت لەو دەکەم
لەو دلارامە بپرسن وا دڵ ئارامی نەما
جارێکی چارێکی دەردم کا دەخالەت بەو دەکەم
سافی یا کافیمە بۆ دونیاو قیامەت یاری خۆم
چیم لە باسی عالەمە هەر زیکری ناوی ئەو دەکەم

**سافی هیرانی**

# قافلە : مەولەوی تاوەگۆزی

هام دەردان ئامان ئەرمەندەن هۆشم
سەدایی وەشەن، مەیۆنە گۆشم
چمان زیلەی زەنگ زەواری مەیۆ
زرنگۆی قافلەکەی وەهاری مەیۆ
قافلەچی ئامان دادەن دەخێڵم
مەک داری خەم خەیلێ زەلیلم
نەرای تیجارەت ئەمیر ووەلی
تۆمایەی رەواج عەبباس وعەلی
ساتێ قافلەکەت ساکن نەسەیر بۆ
یەک عەرزی دێرم ئۆغرت خەیربۆ
گێج زرێوار هەرسم، مەوج وەردەن
سارای مەریوان تەمام هەرکەردەن
بازش هەناسەم سوبوەنەش دەرۆ،
یەخ کەرۆ، قەتار ئاسان بویەرۆ
ئەمجا وە سووزەن موژەی جۆش وەردەم
سەرنووک قەڵەم ئاخ سووراخ کەردەم
وەبەند دووباد مەینەت جگەر
بورازە تا، تای جەوالان یەکسەر
قەیاسەی قایش پۆسەکەی جەستەم
حەڵقەی چەڵەمەی پێشەی شکستەم
رەگ تەن تاڵی، تاڵ وەردەی مێوەنگ
بفەرما یاران، بازان بدەن تەنگ
زەنگ دڵەی تەنگ، زایەڵەی سەدرەنگ
پێکیای تای دەرد ریشەی خەمگوڵەنگ
ووزان نەگەردەن بەرز پێشاهەنگ
بشۆ بدۆدەنگ فرسەنگە وفرسەنگ
مەدەدیا عەلی پەی سەفەر کەرمەیل
مەنزڵ وەمەنزڵ، تا مەنزڵگەی لەیل
بەڵام هەرخاکێ جەوئاسانەکەن
گەرد سفتەی گیان هەراسانەکەن
رەحسەت بۆوادەی ووستەی بارەکەت
نەبووە پاشێل پای قەتارەکەت
جەزیلەی ئەودەنگ چون خەبەردارەن
مەیۆ مەشناسۆن ئاخر دیارەن
مەپرسۆ ئازیر پڕ وەفا وبەینەت
کۆن توجاربا شی سەرقافلەی مەینەت؟
واچە مەرنەدیت نەمام بێ گەرد
جێگە پارچەی گیان پایەندا زیت کەرد

تەخمیسی ئەحمەد هەردی لەسەر
شیعری "شەو"ی نووری شێخ ساڵح

قەت نەدەی ئازاری گیانی مەست و بێدارانی شەو
خۆت نەخەیتە بەر شەپۆلی ئەشکی بێ پایانی شەو
ئەی کچی خواوەندی جوانی وئەی چرای دیوانی شەو
" خۆت بپارێزە لەئاهی دڵ بریندارانی شەو
نەک خوا ناکەردە گیرا بێ دوعای نالآنی شەو "

* * *

وێڵم وتاریکە دەورم، فەرشی رێگەم مەینەتە
بێ کەسم، تەنیا ئەنالم، مەرگی خۆمم عەزرەتە
سازی ئاهەنگی شەوانم، سۆزی جەرگی لەت لەتە
یاوە رو یاروئەنیسم ئاەوئەشکی حەسرەتە
ئافەرین ئەی بارەکەڵڵا، دیدەیی گریانی شەو

* * *

وانەزانی دەستی خەم یادت لەدڵدا دەرئەکا
ئەشکی خوێنینم دەلیلە بۆ کەسێ باوەڕنەکا
گیانەکەم بەو تیشکی چاوەی شەڕلەگەڵ ئەختەرئەکا
دڵ دەبێتە قەترەیەک خوێن ولەدیدەم سەرئەکا
هەرکە رابووری بەدڵما، سوحبەتی جارانی شەو

* * *

هاودەمێ فەرمووی لەبەرچی کردەوەت گریانەهەر
تافی لاوێتیتە، لاوی قەڵبەزەی سەیرانەهەر
من وتم سەیران وخۆشی پێشکەشی شادانەهەر
ئەشکی حەسرەت لازمی جەمعی سیابەختانەهەر
شەونمی سوبحە دەلیلی قەترەیەک گریانی شەو

* * *

هەوڵی زۆرمدا، لەداوی زولفی ئەوبێ مروەتە
دەرچم ودوایی بهێنم، بەم عەزاب ومەینەتە
پێی وتم بێ سوودە هەوڵت تا کووماوی جێگەتە
"نووری"! لەم پێچ وخەمی زولفە نەجاتت زەحمەتە
لای سەخی تەبعان مەحاڵە روخسەتی میوانی شەو

ساڵی ١٩٥٧

پرسیاری ١٤ - بیرورِات
لەسەر کتێبی" توحفەی
موزەففەری یە" چیە بەگشتی
کاری ئۆسکارمانت پێ چۆنە؟

**پڕۆفسۆر ئۆسکارمانی
ئالمانی بەحەق رچەشکێنی
کاری فۆلکلۆری کوردی یە و
بەراستی زەحمەتێکی زۆری لە
سەر ئەو کتێبە کێشاوە.**

هەڵبەت بەم هۆیەوە کە "مان"
تەنیا کەلکی لەسەرچاوەیەک
وەرگرتووە و " ناحەقیش
نەبووە "وئەوێ رۆژێ هەر
ئەوەندەی پێ کراوە، جێی
رەخنە نیە ئەگەر توانیبای
لە هەر بەیتێک چوارپێنج
نوسخە پەیدا بکا و وەک
کوردی زانێکی باش لەبەر
یەکیان رانێ و سەنگ و
سووکیان بکا. ئاشکرایە
توحفەی موزەففەری یەشتێکی
دیکە دەبوو. هەروەک عەرزم
کردن لەزەمانی " مان " دا
ئەوەندەی کردوشێتی لە
قەدەر زۆرە و بە راستی
شایانی پێداهەڵخوێندن و
سپاسە.

بەڵام بێ لەبەرچاوگرتنی
ئەو هەل و مەرجەی کە
"مان" تێیدا بووە و ئەو
بەرهەڵستوگیروگرفتەی کە
بێ گومان بۆ ئەو بووە و
ئێمە هەر رێ شیان پێدا
نابەین ئەگەر بێتوو
بمانەوێ بێ لەبەرچاوگرتنی
خزمەتی ئەو بەرێزەو "برامان
برایەتی و گیسک دانەی دوو
تمەن" و وەک کتێبێکی تازە
نووسراو سەرنجی بدەینێ
دەبێ بڵێین بەداخەوە
ئیرادی یەکجار زۆرە و
ناتوانین بەناوی سەرچاوە-
یەکی باوەڕپێکراوی بەیت
لەسەری حیسێب بکەین. سەر و
گوێی زوربەی بەیتەکانی
نێوەرۆکی ئەوکتێبە پەریوە.
زوربەی بەیتەکان
نێوەرۆکێکی‌تەواو جیاوازیان
لەگەڵ‌ئەسڵی ئەو بەیتەهەیە
و تەنانەت لە دوو سێ
جێ یان پیاو لای وایە
هەڵەی چاپی رووی داوە کە
بە ناوی بەیتێک باس لە
بەیتێکی دیکە دەکرێ.

بەڵام هەر دەبێ سپاس لە
"مان" بکرێ. زۆرتریش لە
خوالێ خۆشبوو " مامۆستا
هێمن" کە بە زەحمەتێکی
زۆر کاری گرانی هێنانەسەر
رێنووسی ئێستەی زۆر پوخت
و لەبار جێ بەجێ کردووە.
ئەگەر مان دەزگای "ضبط"ی
نەبوو، ئەگەر شێوەی فیش
کردن وئارشیوی بە شێوەی
ئەورۆ نەدەزانی، ئەگەر
هەتا ئێوارێ رەحمان بەکرو
یەک دوو کەسی دی بە هەزار
زەحمەت وکوێرەوەری ومنەتی
ئەموئەو رازی دەکرد بەیتی
بۆ بڵێن و ئەو دێڕ بە دێڕ
بڵێ بۆی بنووسنەوە، ئەورۆ
سەدان رەحمان بەکرمان هەیە
هەزاران دەزگامان هەیە کە
کار هاسان بکەن. هەموو

**داوای لێبووردن**

لە سروەی ژمارە ٩ لاپەڕەی
٢٢ دێڕی ١١ بەجێی "بڕەک"
بۆرەکەیی نوسراوە چاکی بکەن.

وت وویژێك دەگەڵ: ع خزری

شتێک دەزانین و لەعیلمی
کۆکردنەوەی باری فۆلکلۆر-
یش شارەزایین دەشزانین کە
کۆکردنەوەی ئەو بابەتانە
چەندە پێویستن و چۆن
پێوەندی یان بە بوون و
مانمانەوە هەیە بەڵام بەو
حاڵەشەوە پاش توحفەی
موزەفەری یە تا ئەورۆ
شتێکی وای "هەرچەند کورت
و ناتەواو" کۆنەکراوەتەوە

پرسیاری ١٥- واباشە
لەبارەی خۆتەوە قسان بکەی
چۆن بوو ئەو بەشە لە
لێکۆڵینەوەت هەڵبژارد ؟

وەڵام: ڕەنگە ئەگەر
شتێکی بڵێم پێت سەیر بێ .
منیش وەک زوربەی لاوەکانی
کاتی لاویم، کاتێک گوێم لە
بەیت دەبوو هەر تەقەم لە
سەری دەهات وتێی نەدەگە-
یشتم . بەڵام منالی
بنەماڵەیەک بووم کەمیوانی
لە دێهاتەوە زۆر بۆدەهات
وپاش پەیدا بوونی زەبت
چ میوانمان وچ زەبتەکەمان
دەبوو بەیت بلێ. وردە وردە
دیتم حیکایەت وبەسەرهاتێکی
خۆشن وبۆوەی دەبوو گوێیان
بۆ رابگرم و هەر ئەو بە
تۆبزی گوێ ڕاگرتنە دونیای
بەیت وبەسەرهاتی کوردیان
پێ ناساندم. ئەوجار بۆ
یەکەمجار کە چاوم بەکتێبی
مەموزین یان خەج وسیامەند
کەوت زۆرم پێ سەیر بوو
کە بۆ مەگەر بەیت بۆوەی
دەبێ بکرێتە کتێب ؟
تەنانەت زانستگاش چاپی
بکا ؟ کەوابێ ئەوەش
کارێکە و ئێستا کەناتوانم
وەک زوربەی لاوەکان لەخۆڕا
بیمە شاعیر و شیعر بڵێم
با ئەو کارە هاسانەی دەست
پێ بکەم. بەڵێ وردە وردە
خەریکی کۆکردنەوەی بەیت و
باقی بابەتەفۆلکلۆری
-یەکان بووم. بەڵام ڕۆژ بە
ڕۆژ دەمدیت ئەو جۆرەی کە
من بیرم لێ دەکردەوە
کارێکی سادە وساکار نیە ؟
بەهەرحاڵ هەر ئەو کارە،
وردە وردە ئەوینداری
بەیتی کردم تاساڵی ١٣٥٣ی
هەتاوی پاش کۆکردنەوەی
زوربەی بەیتەکان مۆتۆر
سیکلێتێکم کڕی وزەبتێک و
دێهاتی دوور و نیزیک بگەڕە
و هاتم. دیتم نە هەر بەیت
بەڵکە هەزاران شتی
بایەخ دارتری دیکەش هەن
کە دەبێ خۆیان پێوەماندوو
بکرێ .

وچان لەلای دوو پاڵەی
ماندووی ئێوارەی بەر سێبەر
و خولقی پڕ مێهر و
مەحەببەتیان بۆ نان و
دۆیەک خواردن، خۆی
دونیایەکی شتی جوان تێدایە.
لەلای چەند بێری دانیشتن و
گوێ بۆ قسە و دەردی دڵ و
ئەو وشە جوان ورەسەنانەی
بەزاریاندا دێ وتۆمارکردنیان
گەنجینەیەکی بایی دارێک
دێنن .زۆرجار وەختاوەختێک
لەگەڵ شوانێک لەنیزیکەوە
بووم، ژیانی جوان وساکاری
ئەوم دیوە ، هاورێم
زەبتێک ودونیایەک مەیل و
تاسە بووە ئەویش بۆ پتر
بیستن و زۆرتر دیتن و
باشتر فێربوون وتۆمارکردن.
ئاکامی چوار ساڵ ژیانی
ئاوا و چەندین ساڵ
کۆکردنەوەی هەر شتەی بۆن و
بەرامی کۆن وکەلەپووری
لێ بێ،بوو بە ئارشیوێکی
تا رادەیەک پڕوبایی دار .
لە ساڵی ١٣٥٧ یشەوە
خەریکی هێنانە سەرکاغەز و
نووسینەوە وهەڵسەنگاندن-
یان بووم و هەتا ئێستاش
ئەو کارەهەروا درێژەی
هەیە .

پرسیاری ١٦- چ کارێکت
لەسەر ئەو بەیتانە کردووە
و لەو رێبازەدا گەیشتوویە
کوێ ؟

وەڵام: ئەوەی راستی بێ
کە گوتم : لە کۆنەوە
خەریکی ئەو بەیتانەم ،
ئەگەر بڵێم ئەو کارە بێ
وچان وهەمیشەیی بووە
دەبێتە درۆ. پاش ئەو چوار
ساڵەی کە هەوڵم بۆ
کۆکردنەوەیان دا ، هەتا
ئەورۆ ئەوەندەی پێمکرابێ
و گونجابێ درێغیم نەکردووە
وبەراستی هەل و دەرفەتم
نەبووە ئەگەریش کارێکم
کردبێ دڵبەندی یەکی زۆر

بەو کارەبووە کە خۆشمسەرم لێی سوڕماوە.

بەڵام گەیشتوومە کوێ ؟ خۆشم نازانم، لە بەرەوە، لام وابوو هەرنووسینەوەیان بەشێوەی ئۆسکارمان بەسە بەڵام هەر هەنگاوێک کە چوومە پێشێ لکێکی تازەی لێ جیا بۆتەوە وئەو لکەش رووی لە لایەکی دی کردووە. بەو شێوەیە کەجاری وابووە هەر لەبیریشم چۆتەوە لەچی گەڕاوم! بەڵام ئەوەی راستبێ چوارچێوەکەم بەو شێوەیە دەستپێ کردووە کە کارێکی وای نەماوە بەڵام دوو شتم لەبەر چاوە.یەکەم دەربەستی رادەی ئەستووری و باریکی کتێبەکە نەبم و دووهەم تاڵووکە نەکەم و هەموو کات ئەوەم لەبەرچاو بێ کارەکە پوختترو بێ ئیرادتر بێ. بۆ وێنە لە بەرگی یەکەمدا کە چی وای نەماوە تەواوبێ کاتێک باس لە شتێک هاتۆتە گۆڕێ هەر مەبەستێکی لام وابووە پرسیار بێنێتە پێش، وام لە پنج و بناوان کردووە کە جێی پرسیار نەیەڵێتەوە.

کتێبەکە رۆژ لەگەڵ رۆژ ئەستوورتر و بە بڕوای خۆم پڕنێوەرۆکتر دەبێ. بۆوێنە کاتێک لە بەیتێک دا دەڵێ: چۆتە پەتری پۆتی، روو ن کراوەتەوە پەتری پۆتی کوێ یە؟" کاتێک باسی وەزیرە چرچە دەکا ،لەبەیتی هەمزا غادا بیۆگرافی وەزیرە چرچە و بارودۆخی سیاسی ئەوکاتانی کەم بەکورتی نووسراوە. کاتێک باسی فلان هۆز و تایفەی کورد هاتۆتە پێش بە جوانی ئەوەی لەبارەیاندا نووسراوە یان بیستراوە روون بۆتەوە.کاتێک باسی مەڵبەندێک دەکا هەوڵم داوە هەتا ئەو جێ یەی گونجابێ و توانیومە دەرەجەی جوغرافیایی ئەو شار و ناوچەیەش روون کەمەوە جا ئەگەر ئەو مەڵبەندە تایبەتی یەکی لەباریشی بێ چ باشتر. بە کورتی هەڵکەوتووە ئەوەی لەبارەی سوارۆیەکی چوار لاپەڕەییدا نووسراوە گەیشتۆتە چل پەنجا لاپەڕەپەراوێز.ئەوجار وێنە وبیۆگرافی بەیتبێژ و حیکایەتوێژیش کەکارێکی تازە نیە.ئەوەی لام گرینگە ئەوەیە کە نۆتی بەیتەکان بە شێوەی"ئاوانویسی»، بە شێوەیەکی کە هەموولەرەکانی دەنگ لەخۆ یدا جێ بکاتەوە بنووسمەوە، کە بە داخەوە لەوکارە پڕ زەحمەتەدا، کەسی وام وەگیر نەکەوتووە بەتەواوی شارەزابێ.ئەوەی کراویشە زۆر بەدڵم نیە و رەنگە هەر ئەو مەبەستەش کارەکەی وەدوا خستبم کە هیوادارم کەسێکی شارەزا پەیدا بێ وئەوکارە قورس و گرانە وەئەستۆ بگرێ کە هەموو لایەک لێی مەمنوون بین. لەو کارەدا لەگەڵ ئەوەی کە زوربەی بەیتەکان بەباشی لەناوچەی موکریاندا پارێزراون هەوڵم داوە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان لە باقی زاراوەکانیش کەلک وەرگرم. بۆ وێنە کتێبێکم وەدەستکەوت بەناوی «بەیت و سەرهاتێد کوردی"کەبەختی رووسی یە و کۆ کراوەی شامیلۆف و حاجی جوندی و... یە وبەزاراوەی کوردەکانی ئێرەوانە. ئەوەم هێناوەتە سەر رێنووسی خۆمان و بە شێوەیەکم مانا لێ داوەتەوە کەهەموو کەس لە نێوەرۆکیان بگا کە ئەگەر ئەوڕۆش ئەو کارە بەرجی دۆزینەوەی زۆر وشەی رەسەنی کوردی سوودێکی دیکەی نەبێ لانی کەم لە داهاتوودا لەزۆر بارانەوە بەکەلک دەبێ. لە باری تەرکیبی رستە، گۆڕانی وشەکان ،مۆسیقای شیعر و مۆسیقای بەیت و لە جوانی ناسی لەبەیتدا.

هەڵبەت لەگەڵ تەواوی ئەو مەبەستانە بروام وایە ئەو کارە لەتوانایی کەسێک یا دوو کەسدا نیە و ئاشکرایە نە ئەو جۆرەی باسم کرد و نە ئەو جۆرەی خوم دەمەوێ نایەتەدەر.

دریژەی هەیە

**١- بای زریان :** بایەکی ساردە و لە رۆژهەلاتەوە بەرەو رۆژئاوا دێ،هاوینان ناهێلێ دەغل ودان زۆر وشک بێ وبۆ هەلاویشتنی خەرمانیش بەکەلکە

**٢- شەمال :** ئەو بایە لە هەموو وەرزەکانی سالدا دێ ولە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەلات دەچێ، مامناوەندی بای شەمال ٤٠ کیلۆمیترە لە سەعاتدا کە بۆ گەیشتنی میوە وهەلاویشتنی خەرمان قازانجی زۆرە. دەرسەدی هاتنی ٨/٩٪ لە سال دایە و کەمترین دەرسەدی هاتنی بایە .

**٣- بای سەلماس :** بایەکی ساردە ولە شومالەوە بۆ جەنووب دێ بەلام وەکوو بایەکانی دیکە توند نیە .

**٤- بای قوبلە :** لەجەنوو- بەوە بۆ شومال دێ.

مەودای شاری شنۆ لەگەل ناوەندی ئوستان ( ورمێ) ٧٢ کیلۆمیترە لەگەل شاری نەغەدە ٣٣ کیلۆمیتر ومەودای بۆ خانێ ( پیرانشهر) ٥٠ کیلۆمیترە .

**سێلاو و ئاودڕگەکان :**

شنۆ لە داوێنی بەرزایەکانی شومال و داوێنی بەرزایەکانی رۆژهەلات دایە بە سەرنج دان بەلایەنی نشێوی زەوی وزار لە شومالی رۆژئاواوە بەرەوجەنووبی رۆژهەلات دەچێ ، بەهۆی بارانی زۆری ناوچە و ئاو وهەوای تایبەتی بەفر لەو بەرزاییانەدا یەکجار ناتوێتەوە بەچەشنێک بەفری کۆن بەفری نوێی بەسەردا دەبارێ

جسنی بەردەکانی ئەو داوێنە ئازەرین وبە ئاو هەلنامسێن کەئەوەش یەکێک لە هۆیەکانی سێلاوگری ئەو ناوچەیە ،لەکاتی باراندا پالاوەکەی لە رۆژئاواوە، سەربەرەوژێر دەبێتەوە و بەرەو شار وەرێ دەکەوێ و لە بەشی شومالی شاردا لافاو پێک دێنێ .

چۆنیەتی ئاودڕگەکانی بەچەشنێکە کە بەهۆی ئاوی باران و تێپەڕبوونی زەمان دوو دەرەی تەبیعی پێک هێناوە کە یەکێک لە شومالی ترین بەشی شارە و بەرینایی تەقریبی ١٥ میترو قوولایی ٧ میترە، لە بەرزاییەکانی شومالی غەربی بەرەو جەنووبی شەرقی دێن ولە بەشی شومالی غەربی شار تێکەل جۆگەی نەلیوان دەبن .بێجگە لەو دوو دەرەیە لافاودڕێکی دیکەش لەرۆژئاوای شار دەست پێدەکا وتێکەل جۆگەی کەرخۆر دەبێتەوە. کاتێک سێلاو هەلدەستێ چونکە پانایی جۆگەی نەلیوان ٣ میترە وقولایی ١/٥ میترە ئاوەکە ناکێشێ بە کووچە و کۆلان وشەقامەکانی شاردا بلاو دەبێتەوە، زیان و زەرەرێکی زۆر وە خەلک دەکەوێ .

سێلاوی دەرەی شومالیغەربی پاش تێکەل بوون لەگەل جۆگەی نەلیوان بەهۆی کانالێکی سەرداپۆشراو دەرژێتە رووباری ئەسلی شار بەلام کانالەکە رێک نیە

وئاوەکە ڕەسەر دەکەوێ و زیانێکی زۆر لەخەڵک دەدا .

هەروەها بەهۆی تەسکی و قووڵ نەبوونی جۆگەی کەرخۆر ئاوی باران دەچێتە نێو شار وخەسارەت پێک دێنێ. بەڵام ڕووباری گەورەی شار لە دوو لاوە بە بەرد و سمیت داندراوە و دانیشتووانی گەڕەکەکانی دەوروبەری لە خەتەری سێلاو بەدوورن.

**بوولەرزە لە شنۆ :**

ساڵی ١٣٤٩ لە ٣٥ کیلۆمیتری جەنووبی شار بوولەرزەیەک بەتوندی ٦ رشتێر هاتووە کە توندترین بوولەرزەی ناوچە ناسراوە وسەبت کراوە بەڵام زۆر بە هێمنی شاری لەرزاندەوە. ساڵی ١٣٦٠ جارێکی دیکە بوومەلەرزە شاری ڕاژاندووە وخەسارەتی زۆری بەدواوە بووە ،بەڵام زیانی گیانی نەبووە .دیسان ساڵی ١٣٢٠ (ک - م) بوومەلەرزە شاری بەتەواوی لەناوبردووە .

**ڕووبارەکانی شاری شنۆ:**

**گادەر :** یەکێک لە گەورەترین ڕووبارەکانی ناوچەی شنۆیە کەبە فارسی (قادرچای) پێدەڵێن ولە کتێبە مێژووییەکاندا (کدیرش) نووسراوە .

گادەر لە کێوی دالامیری دزەی مەرگەوەڕ کەکەوتۆتە شومالی شنۆ بەرەو ناوچەی شنۆ دێ وسەرچاوە ، ئەسڵی یەکانی بریتین لە :

" کێوەکانی پۆریک ، گردە سوور ، گردە پووران کە لە سەرەتاوە هەشت چاوەن بەڵام پاش تێکەڵ بوونەوە دووچاوە پێک دێنن بەناوی گادەری چووکە وگەلاز ( چای) کە بە نێو شاردا رادەبرێ وپاش تێکەڵ بوونەوەی هەر دووک گادەری گەورە پێک دێ.

ئەو ڕووبارە سەرەتای

دەست پێ کردنی بەرەو رۆژ ، ئاوایە و لە نزیک سنووری عێراق بۆلای جەنووب دەکەوێتە ڕێ، هەزێمی ئاوگیری ١٩٠ کیلۆمیتری چوار گۆشەیە و درێژایی ١٠٠ کیلۆمیترە و مامناوەندی چاردەساڵەی ١٢/٧٢ میتری موکەعەب لە سانیە دایە و مامناوەندی چاردەساڵەی (بدە) ئاوی ڕووبارەکە ٤٠٢ میلیون میتری موکەعەبە لە سانیەدا ودرێژایی لە ناوچەدا ٣٣ . کیلۆمیترە . ئاوی هەمیشە هەیە وبە دوازدە دێ دا تێپەر دەبێ و لەئاکام تێکەڵ گۆلی ورمێ دەبێتەوە

لەسەرەتاوە سەربەرەوژێر بەنێوان دەرەکاندا بەتوندی دێتەخوار بەڵام کاتێ گەیشتە دەشتی شنۆ زۆر بە مەندی دەڕوا ولیمێکی پێش چاویش بەجێ دێڵێ،چون ئاوی ئەو ڕووبارە لە بەفراوو سەهۆڵاوی زۆزانەکان پێک دێ . لە وەرزی بەهار زۆر و لە هاوین دا کەمدەبێتەوە ، بۆ کشت وکاڵ وخواردنەوە لولە کێشی وکاناڵ کێشی کراوە .

لقی دیکەی گادەر نەڵۆس وکانی ڕەشە کەلەکێوەکانی جەنووبی غەربی سەرچاوە دەگرێ و پاش تێپەربوون بە گوندەکانی چەپەرئاوا ونەڵۆس ـ دا تێکەڵ گادەرچای دەبێ ودرێژایی ٥کیلۆمیترە دێهاتی دەوروبەریش کەلکی لێ وەردەگرن بەڵام ساڵێ چوار مانگ ئاوی هەیە .

**گەلاز چای :**

لە کێوەکانی شومالی غەربی شنۆ ،سەرچاوە دەگرێ. لقێک لە گادەر کەخۆشی چوار

لقی هەیە بەناوی جلی دار لە کێوەکانی رندۆڵە وبابۆڵە سەرچاوە دەگرێ دووهەم گومی راج کە لە گەرمەسێر سەرچاوە دەگرێ ،سێهەم چل ئاش ، چوارەم هەوارخاتوون مامناوەندی ١١ ساڵەی (بدە) ٥٣/٤٠٠ میتری موکەعەبە ئاوی ١/٦٦ میتری موکەعەب لە سانیەدایە ،بەهۆی نشێوی

زۆر رژدە بەلام پاش تێپەڕ بوون لە کێوەکان لەدەشتی شنۆ هێدی دەبێتەوە .هاوینان ئاوی کەمە وبەدرێژایی ٢ کیلۆمیتر بەنێو شاری شنۆدا دەڕوا ،بۆ کشت و کاڵ و خواردنەوە ومەلە کەلکی لێ وەردەگیرێ .

**چۆمی گردکاشان :**

لە کێوەکانی شومالی رۆژهەلاتی شنۆ سەرچاوە دەگرێ وبە شەش گونددا تێپەڕ دەبێ . درێژایی لە چوارچێوەی ناوچەدا ٦ کیلۆمیترە و دوو مانگ ئاوی هەیە .

کانگاوئاوەکانی مەعدەنی و غەیرەمەعدەنی :چەند کانیاوی مەعدەنی لەناوچەی شنۆدا هەیە کە خەلک بۆ دەرمانی نەخۆشی ورۆماتیسم ونەخۆشی پێستی کەلکی لێ وەردەگرن.کانی گراو لە هەموویان بەناوبانگ ترەولە نێوباغێکی قەراغ شار دایە. لەسەردەمی دەسەلاتداری رۆمی یەکان چواردەورەیان دیوار کێشابوو.کانیاوەکانی دیکەی بریتین لە: سولتان مستەفا (کانی با)،پیر رەش، کانی بای شێخ رەش، کانی پۆلیەلە گوندێکی ٥کیلۆمیتری شار و ئاوی کانی یەکە مەعدەنی یە لەکەلێنە بەرد هەلدەقولێ و ٢ میتر دوور، دەکەوێتەوە ودەبێ بە بەردی ئاهەکی. کانی یەکانی بەناوبانگی تر بریتین لە: کانی مەرگەوەڕ،تۆبەبلاغ عەینەرۆم ،سێ کانی.

**قەبرستانەکانی شنۆ :**

شنۆ چوار جێگای بۆناشتنی مردوو هەیە کەبریتین لە:

**١- شێخ عبدالعزیز ٢- سولتان مستەفا ٣- شێخ سمایل ٤- قەبرستانێک کە کەوتۆتە شومالی شار.**

کانگا یا بنەکانی بن ئەردی: لەداوێنی کێوی رەندۆلەدا کانی یەک بەناوی کانی چاورەش دەردەقولێ کە ئاوەکەی چەورە و لە پێشوودا بۆسوتەمەنی کەلکی لێ وەرگیراوە. بە بڕوای پیاوانی خاوەن را گۆیە لە رەگەکانی نەفتی کەرکووکە و وێنەی لەدێ شەمش وسەردەرێ هەیە .

بەردەزەرد بەرقەدێکە لە شومالی غەربی شنۆ کە ئاسەواری بەردی مەڕمەڕو بەردی ئاسن لەسەر ئەو بەردە دیتراوە.

لە دەرەی گردکاشان بەردی ئاهەکی دەبیندرێ کە لەبەردە ئاهەکی یەکانی کێوی زاگرۆسە یانی هی ئاخرەکانی دەورەی دووهەم و سەرەتای دەورەی سێهەمی ئەردناسی یە. لە سەرەوەی ئەو بەردانە بەردی (دگرگونی) دەبیندرێ وبەسەرنج دان بەو راستی یە کە لەهەرجێگایەک ماگما دەگەل ئاهەک وێک کەون بەردی مەڕمەڕ پێک دێ ، ناوچەی دەشتەبێلێش چون بەردی ئاهەکی زۆرە لەوانەیە بەردی مەڕمەڕیشی هەبێ .

**درێژەی هەیە**

# ئاخ شلێرۆک (۱)

پەرویز جیهانی

ئاخ شلێرۆک چیایێ بلند هەر هەبی
ل ناڤا دل سلاڤێ مە بۆتە بی
هەربمینی شلێرۆکێ پیر نەبی
چیایێ بلند ، جی ،مەسکەنێ کاڵ وباڤ
نیشتمانێ زۆر جوانێ گول خوناڤ

* * *

شلێرۆکێ جی یێ باڤ وباڤ پیرا
چیایێ بلند ئەهەی دیلێ جوت،نیرا
تویی هەما لناڤ مەژی و بیرا
ئەو بینبەرێن تەیە جوان وسەری
دینە بیرا من گەلەک بیرەوەری

* * *

ئەوبینبەرێن تەیەبەدەو ،رەنگ برەنگ
سۆسن وبەیبوون وگولێن شۆخ وشەنگ
دووری وانا دلێم گەلەک بوویە تەنگ
تا مرنێ ئەزێ بێژم شلێرۆک
دیاری یاشڤانی یە هەلەکۆک

* * *

بینبەرێ تە ئەزێ حەمووکێ بێژم
کۆلا دلێ خوپێ وانا بریژم
هەرچەند کوئەزسەرکەندا لێ پڕلێژ م
ئەزێ بێژم ل هەر دەم ول هەرگاڤ
پەسنا حەموو سۆرگولێن گرتی خوناڤ

* * *

ئاخ شلێرۆک ل سەرەتایا بوهار
بایێ " سۆراڤا " دکرە زارە زار ،
دەما چیا هەڤڕا دبرن هەوار
دگۆن بوهار هات مەها ئاخ لێڤەیێ
زاڕا دلیست ل سەربەرف وکوشرەیێ

* * *

خال دکەتە پێسیرا چیایێ بلند
تەڤ رەش دبوون حەموعەردێ دۆرا گوند
دۆرا چەما دچلڤلین چەقاس ڕند
رەش بەلەک وپنی پنی دبوون دەشت
تە دگۆقەی پلنگ تێدا دکن گەشت

* * *

ئاخ شلێرۆک گاڤا عەرد دبووبەلەک
دهاتن کۆم کۆم پڕکێد رەشۆلەک
ل سەربانا بەرەڤ دبوون وان گەلەک
رەشۆلەکا ددان مزگینی یا بوهار
ل خەوارا خاش دکرن وان هەوار

* * *

دبرسقین دوورڤا ئاڤێد کەڤی یا
دخشکین بینا ماراژهەرجی یا
بەلەک دبوون عەردێ پێسیراچی یا
دئاڤییا بەرفا حەموو چیا وچۆل
بێهنا بوهارێ ددا هەردەشت ودۆل

* * *

خۆش دحورمین شەڤێ بوهارێ چەماڤ
هەڤ دکەتن چەم را دبوون وەک سێلاڤ
شەڤەرەشێ بوهارێ بوون بلقەتاڤ
چاڤا چاڤ نەددیت دبووشەڤەڕەش
پێرو مێزین ل عەسمانا دبوون گەش

* * *

لێمشت وسێلاڤا چ پێل قەددان
پێلێ ئاڤێ وەدپەلشین کەندالان
لەزۆبەزۆ ئاخ وخولی هەڤددان
کەف سەردکەت دحورمجی دین دبوو
دەڤێ ئاڤا هێدی زەروشین دبوو

* * *

بایێ رۆمێ گوژ سەرتەدا دڤزاند
عەورێ کەڤەر کراسێ خو دگڤشاند
بایێ ئەوان بوّجی یەکی دی دشاند
هەوا دبوو سایی وعەرد دبوو شێن
ژچیمەنا گول دەردبوون دهات بێن

* * *

ئاخ شلێرۆک دەماک باران دباری
تەیرو توویا هەڤدکرن هەواری
خوّش دنالین قومری وکەو بزاری
مەژی دگەل هەڤالا دکر یاری
کێف وحەنەک ، لاقردی وبنداری

* * *

شلێرۆکێ لێ ئەو رۆژا مە کانێ ؟
مەخۆش دلیست بەر خونا ڤابارانێ
گاڤا کوعەور هوور دکەتە گریانێ
کەسکە سۆرێ، یانێ بووکا بارانێ
نوور درەشاند ل پێسیرا زۆزانێ

* * *

نوور و تریشک ژێ دوەشین ل هەردەر
رەنگ ب رەنگ دچلڤلی سەروبەر
سۆرو قیچک ، کەسک وهێشین،کەڤ وزەر
ئەم درەڤین بەرب وێ کەسکە نسۆرێ
لێ کەسکە سۆر پێدەر درەڤی ژۆرێ

* * *

دگۆتن هەرکێ سەروێ را بازبدە
یێ دەستێ خو ل دەستێ دلخازبدە
دلێ خوەدا هەرچی کومراز بدە
دێ بگیژە نێتا دل وئەڤیێ
هەرکەسێ کو دەستێ خۆ بگەهینێ

* * *

ئاخ شلێرۆک دەما برووسک دقووژی یا
تریشک لبەر عەورێ کەڤەر درژی یا
لێڤی ل دەر کەندالێ کەر دکشی یا
دەستەدەستە زاروو دگەل هەڤالا
بۆ تەماشە دهاتن سەرکەندالا

* * *

کۆلا دل را عەور وعەسمان دگریيان
گول وچیچەک بەروێ گری یێ دکەنییان
چەم وکانی هەڤ دکەتن دخوشییان
وەکی مارا پێل ڤەددان دهەژییان
ل پێسیرا زانگ وزاخا درژییان

* * *

بارانێ سەرچاڤێ چیا دشووت باش
تەرو تەمیز دبوون حەموو زانگ وکاش
هەوا چەقاس پاقش دبوو چەندێ خاش
هەوا پاشی بارانێ چەندێ خۆشە
دلحەبینە ، پرئەڤینە زۆر نۆشە

«دوکتۆر عەزیز ژیان»

لە ئیسپانیاوە:

# ئەدەبی ئیسپانیا

ئەدەبیاتی ئیسپانیایی وەختێک هاتۆتە دنیا کە، تەنانەت زمانی ئیسپانیا ـ یش نەبووە، بۆ ماوەی نیزیک هەزار ساڵ پیاوە ئەدیبەکانی ئیسپانیاو رۆمی بە زمانی لاتین دەیان نووسی . لەنێوئەواندا **"سینیکا ، "لۆکان" و مارشڵ و "کینتیلیان** بەناوبانگن .

هەتا سەدەکانی دە و یازدەی میلادی زوربەی نووسراوە گرینگەکان کە بەشی زۆریان ئایینی و ئەدەبی بوون بەزمانی ئەو مەلبەندانە دەنووسران کە دانیشتووەکانیان جوولەکە وموسوڵمان بوون و لە نێوەراست وژووری ولاتدا دەژیان .

هەوەڵ نووسراوەیەک کە بە زمانی ئیسپانیایی دەرکەوت دیوانێکی شیعربوو واتە شیعرەکانی سەیدی من کە لەسەدەی سێزدە نووسرابوو. شیعرەکان باسی بەسەرهاتی قارەمانێکی خەڵکیان دەکرد خەباتکەر، کەشاری والینیای بەرامبەر بە عەرەبەکان پاراست . هەر لەو سەردەمەدا بوو کەغەزەلە رۆمانتیکەکان بە زمانی ئیسپانیایی دەرکەوتن کە ئەوی هەرە بەناوبانگیان بەناوی "هۆی عیشق"ناسراوە.

ئەگەرچی ئەو نووسراوانە هەموو ئیسپانیایی بوون بەلام زوربەیان بە لەهجە ناوچەیی یەکان نووسرابوون و کەمتر وەزمانی ئەورۆی ئیسپانیا دەچوون .

لە ماوەی دوو یا سێ سەدە پاش ئەو سەردەمە زوربەی کارەئەدەبی یەکانی رۆژهەلات وەرگێردرانە سەر لەهجەی کاستیلیان .

سەدەی چاردە بوو بە سەردەمی دەرکەوتنی هەندێک نووسراوەی پەند و نەزیلە کە زوربەیان ئەخلاقی بوون نە چیرۆک . هەر لەو سەردەمەدا وەرگرتنی چیرۆکی حەماسی وئەفسانەیی لە ئەدەبی ولاتەکانی دیکە بوو بە داب . چیرۆکە عەرەبی یەکان زۆرکەوتبوونە سەر زمانان.هەروەهاش بوو ئەفسانەکانی ئارتۆرشای ئینگلیس ، شارلەمانی فەرەنسە وپالەوانەکۆنەکانی یۆنان و رۆم .

هەوەڵین چیرۆکی ئیسپانیایی واتە **"سیفاری سوارچاک** بوو کە باسی بەسەرهاتەکانی **"سوارەی خەڵک**"ی دەکرد کەئافرەتێک دڵی رفاندبوو .

زوربەی ئەو چیرۆکانە هەر بەدەست دەنووسران وبۆ گوێدێران دەخوێندرانەوە هێندێکیشیان لەبەر دەکران و دەبوونە گۆرانی .

تا ساڵی ١٤٧٤ لە ئیسپانیا مەکینەی چاپ نەبوو .ئەگەر چی لەوساڵەدا چاپ هاتە ئیسپانیاش بەلام لەبەر دەست بەسەرداگرتنی کلیسا زۆر کەم کتێب وچیرۆک لە چاپ دران .

**سەدەی زێرین**

نیوەی دووهەمی سەدەی شازدە وبەشی زۆری سەدەی حەڤدە نەک هەربۆئەدەبیات بەڵکوو بۆمیعماری وهونەریش بە سەدەی زێرین دەناسرێن .

ئەو سەردەمە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی شیعرەکانی دوو شاعیری هەرە بەناوبانگ واتە **"خوان بوسکان المغابیر" و"گارسیلا سۆدلابیغا "** دەس پێ دەکا . شایانی باسە کە بەناوبانگترین کتێبی ئەو سەردەمە چیرۆکی **"دۆن کیشۆتی"** خەڵکی مانچا

نووسراوەی "**میگل دسیروا ـ نتس**" بوو .ئەمکتێبە یەکێک لەشارەکانی ئەدەبیاتی جیهانە کە سەرنجی زۆر کەسانی بەرەو چیرۆکی رۆمانتیکی راکێشا و زۆر کەسیش لاسای نووسەرەکەیان کردەوە و دۆن کیشۆتی بەدەڵیان نووسی . هەر لەو سەردەمەشدا چیرۆک گەشەی پێدرا .یەکێک لە چیرۆک نووسەهەرە بەناوبانگەکان کەبەتێکۆشەرترین نووسەری مێژوو ناسراوە " **لوپی دویگاکارپیو**"یە کەنزیکەی دوو هەزار نمایشنامەی تراژدی و کۆمێدی وئایینی نووسیوە . ئەو پیاوە مەزنە کە بە بناغەدانەری تئاتر لە ئیسپانیا ناو دەبرێ دۆستی نێزیکی " میگل دسیروانتس" نووسەری دۆن کیشۆت بوو .

بەداخەوە دەس درێژی بێ سنووری کلیسا وشایەتی بۆ سەرکاری ئەدیبەکان و راکێشانی بیروهەستی وان بەرەوچوارچێوەی کۆنی کاتۆلیکی سەدەی زێرینی ئەدەبیاتی ئیسپانیای دوایی پێ هێنا و هەتا نزیکەی سەدساڵ نووسەری بەناوبانگ لەئیسپانیاهەڵ نەکەوت . پاش مردنی فێردیناندی حەوتەم لەساڵی ١٨٣٣ شەپۆلی **رۆمانتیسیزم** ئیسپانیای داگرت . ئەوەش بەربەرەکانی یەک بوو لە لایەن هونەرمەندەکانەوە لە دژی وەزعی نالەباری سیاسی کە ئیسپانیای لەولاتەکانی دیکەی ئورووپا وەپاش خستبوو .لەو سەردەمەشدا نووسەری زۆر گەورە هەڵکەوتن وەکوو " **زویلا** "**ئیسپرونیدا** " ،"**لارا** " پاش ئەوانە چیرۆک نووسەکانی ناتۆرالیست دەرکەوتن کە پیاوی گەورەی وەک "**پیریدا** "**پیریس گالدوس** و " **امیلیا پاردوبازان**" لەوانن .

ئەدەبیاتی سەدەی بیستی ، ئیسپانیا ،سەبارەت بە لە دەس چوونی ئەو ولاتانەی کە ئیسپانیادەستی بە سەردا کێشابوون ولەبەر شەڕەکانی ئیسپانیا لە قارەی ، ئەمریکا زۆر کەوتۆتە ژێر تەئسیری ژانی گەل .شێوەی **مۆدێرنیزمی** ئیسپانیا بەرهەمی ئەو سەردەمەیە شاعیرەکانی ئەو سەردەمە هەر چاویان لە رابردووی ئیسپانیا بوو وبەئاشکرابی شیعرەکانیان لە ژێر تەئسیری **لۆیزدگۆنگورا** شاعیری سەدەی زێرین بوو.. لەشاعیرە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە کەغەزەلیان دەگوت **رۆدێن داریۆ و خوان رامۆن خیمینیز** بوون .

لەماوەی ساڵەکانی ١٩٣٠ و١٩٤٠ زوربەی هونەرمەندو نووسەرەکانی ئیسپانیا لە

دەرەوەی ولات دەژیان چونکە نە دەیان توانی لەبەرامبەر سانسۆر ودیکتاتۆری فرانکۆ چاو بقووچێنن نە هەست و بیریان بگۆڕن.**پیکاسۆ** وێنە گەری بەناوبانگ یەکێک لەوانە بوو کە ئیسپانیای بەجێ هێشت و چوو بۆ فەڕەنسە .

لەو سەردەمە نالەبارەو ناخۆشەدا شیعری شاعیرە بەناوبانگەکان وەک:**گارسیا لۆرکا " مانویل مەچادو و "میگیل هیرناندیز**" قەدەغە کران .

گارسیالۆرکا شاعیر و هونەرمەندی هەرەبەناوبانگی ئەو سەردەمە تەنانەت خرایە بەندیخانەش و لە ساڵی ١٩٣٦ تیرەباران کرا کە گەلی ئیسپانیا هەتا ئەورۆ هەر شینی بۆ دەگێرێ

لەکوردستان دا وەرزێری ومەڕداری لەکارەکانی بنەڕەتی دەژمێردرێن،یەکێک ، لەکارەکانی سەرەتایی وەرزێری جۆگەماڵ یا جۆماڵ کردنە .جۆگەماڵ لەکوردستاندا شوێنەکی تایبەتی هەیەخەڵکی کوردستان مانگی ڕەشەمەلە مزگەوتەکاندا خڕدەبنەوەو باس لەجۆگەماڵ وکاری وەرزێری دەکەن ودەڵێن: برالەوا بەهارهات وکاتی جۆماڵ کردنە دەبێ لەئێستەرا جۆگەکانی زەوی ومەزرامان خاوێن بکەینەوە بالەکاتی ئاو داشتندا کارمان بەهاسانی بڕواتەپێش :

ـ کەدەیابیست ڕۆژلەبەهار تێدەپەڕێ وەرزێرەکانی کوردستان خەریکی جۆماڵ کردن دەبن.

جۆماڵ کردن بەتێکڕایی جێ بەجێ دەبێ.یانی تەواوی وەرزێرەکان پێکەوەڕۆژێ ، جۆگەیەک خاوێن دەکەنەوە .

ئەوانەی زەوی وزاریان هەیەوبۆخۆ ناتوانن بچنە جۆماڵ کردن، پیاوێک بەپوول یابەگەنم حەقدار دەکەن ئەڵبەت حەقی ئەو پالەیە پوولی نەغدەیاگەنمی سەر خەرمانانە .

جا ئەگەر دەستیان بەجۆماڵ کرد ، دوو ڕۆژپێش لەجۆگەماڵ کردن میراو دەچێ ئاولەجۆگە دەکا کەویشک بێتەوەبەیانی هەرکەس لەماڵەوەدەردەکەوێ

وتـــوورەکـەیەک نان وچای و
پێمەرەیەک لـەسەرشانـی لـە
بەر دەرکی مزگەوت کۆدەبنەوە.
کەهەمووهاتن وکەسێـک لـە
خاوەن مـەزراکـان نەمـان
پێکەوە بەرەو جـۆگـە وەرێ
دەکەون. لەرێگادا بەگاڵتە و
گەپ وحەیران وگۆرانی رایدە ـ
بوێرن تادەگەنەسەرکار.کە
گەیشتنە سەرکار،توورەکەکانی
نان وچای لەجێگایەکی تایبەت
دادەنێن، ئەوسا میراو
پاڵەکان دەکاتە دووبەش
ئەگەر هەرلای دەنەفەربێ‌یەکی
دەپێمەرەیان بۆ دەپێوێ و
بەم جۆرە هەرکەس خەریکی

بەشی کارەکەی دەبێ.لەوجۆگە ـ
یەدا دەبێتە هەراوهوریایەکی
سەیر وهەرکەس تێدەکۆشێ
زووتربەشی کاری خۆ تەواوبکا
جۆگە شە جێگای خۆش ونا خۆش
هەیە ، جێگای بڵیندونەوی
هەیە .دەستەی واهەیە کە
دەکەوێتە جێگای نەوی وخاوێن
وکارەکەیان زوو کۆتایی
پێ دێ.

دەستەی‌واشهەن کەدەکەونە
جێگای بڵیندوو پڕقوڕ
وحەیاتیان لێ دەبڕێ وکارەکە ـ
یان زووخەلاس نابێ.لەکاتی
کارکردندا هەمیشەدەستەیەک
کاردەکەن ودەستەیەکیش
دادەنیشن.جاری وایە دەگەڵ
کار،گۆرانی وحەیران ولاوک
گوتنیش هەرهەیە.

کە کاتی نان وچاش هات
چەند نەفەران دەنێرن بۆچا
لێنان،کاتێکەچاسازبووهەموو
پێکەوە بەسەیر وسوحبەت و
گاڵتە وگەپ چایەکەیان
دەخۆنەوە .جاری‌وایە یەک
شیرێژ ورۆنی پێیە ،یەک
ماستی پێیە ،یەک پەنیر
وهێلکەی پێیە ، یەک نوێشک
(کەرە)وسەرتوێ‌یپێیە ،تەواوی
ئەوپێخۆرانە پێکەوە دەخۆن
پاشخواردن وخواردنەوەدیسان
هەڵدەستن وخەریکی شۆڵ وکاری
خۆیان دەبن. کاری‌جۆماڵ کردن
کەتەواو بوو ،بەندی ئاوێ
تێک دەدەن وسەرلەنوێ ،
بەندێکی دیکەی پتەوتر و
قایمتر سازدەکەن.

هەمیشە لەکاتی جۆماڵ
کردندا پاڵەکان کایەی جۆرا و
جۆریش‌دەکەن وەک : زۆرەبانی
کیسەڵ پسەکێن،بارەخوێ ،
عرووسی، هەمزەلێن، .... زۆر
جاروایە لەوکایانەدا،دەستو
لاق وسەریان دەشکێ.

دابێکی دیکەش لە نێو
کرێکاران بەتایبەت لەنێو
پاڵەکانی جۆماڵ داهەیەئەگەر
هەڵ کەوت ریش‌سپیەکی ئاوایی
بۆلای جۆماڵەکان هات
یەکێک لەجۆمالەکان پێمەرە ـ
یەکی بۆهەڵدێنێ. ئەویش
پارەیەکی لە گیرفانی دەردێنێ
وبەوانی دەدا ،جۆماڵەکان بەو
پارەیە خواردەمەنیەکی
دەکڕن وپێکەوە دەیخۆن.

ئێواران کاتی گەڕانەوە
کەهات پۆل پۆل بەرەوماڵ
دگەڕێنەوە .جاری وایە ئەو
دەستانە هەریەک هەوایەکی
دەڵێن وبەشادی وپێکەنینەوە
بەرە وماڵیان دەچن.

بەڵام ئێستا ئەوکارانە
هەموو بەماشین دەکرێ وکاری
جۆماڵ کردن وا بەرەبەرە ،
خەریکە لەبیربچێ ونەمێنێ.

# ئێمە و خوێنەر

تکا لەخوێنەرانی بەڕێزی سروە دەکەین ئەم خاڵانەی خواروو لەبەرچاو بگرن :

١- نووسراوەکان بە خەتێکی خۆش بنووسن وابێ بۆ خوێندنەوەی تووشی گیروگرفت نەبین .

٢- لە دیوێکی کاغەز بنووسن .

٣- ناونیشانی خۆتان تەواو بنووسن تا وەڵامی نامەکانتان بە دەست بگاتەوە .

٤- ئەگەر بابەتی وەرگەراومان بو دەنیرن ئەسلەکەشی بو بەراورد و هەلسەنگاندن بو ئەم ناوەندە بنیرن

٥- ئەگەر دەگونجێ نووسراوەکان لە دوو یا سێ لاپەڕەی گۆوارەکە پتر نەبێ بۆئەوە جێگە بۆهەموو بابەتێک ئاواڵە بێ .

٦- دەستەی نووسەرانی سروە وەک گۆوارێکی فەرهەنگی-ئەدەبی دەتوانێ لەباری رێنووس ورێزمانەوە دەست لە نووسراوەکان وەربدا .

٧- ئەو بابەتانەی بۆ ئێمەی دەنێرن لەبابەگانی-دا هەڵدەگیرێ و ناڕێتەوە بەخاوەنی .تکایە نوسخەیەک لای خۆتان رابگرن .

دەستەی نووسەرای سروە

مەهاباد : عەلی رەمەن

پاش رێز وسڵاوی زۆر نامەکەت گەیشت لەوەی کە وەڵامی نامەکانی رابردووت نەدراوەتەوە داوای لێ بووردن دەکەین .

نووسینی وتارێک لەسەر رێنووسی کوردی لە سروەدا پێویست ناکا . رێنووسی کوردی ئەوەیە کە سروە پێی دەنووسرێ. لەکۆنگرەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردیدا ئەو باسە کراوە و تەواو بووە.

لەکوردستانی ئێراندا سێ لەهجەی گەورەی کوردی هەیە کەبریتین لە : کوردی شیمال (بادینی) کوردی ناوەندی (سۆرانی) کوردی جەنووب (هەورامی - لوری)

لەکوردستانی عێراقدا بادینی وسۆرانی باوە ولە کوردستانی تورکیەدا تەنیا کوردی بادینی رەواجی هەیە.

لەهجەی رەسمی کوردی، لە ئێران کوردی ناوەندی یە کە سروە پێی دەنووسرێ. لە عێراقیشدا هەر وایە. لە تورکیەش بە کوردی شمال دەنووسن .

لەگەڵ چوونەسەری پلەی زانست وفەرهەنگ زبانی یەکگرتووش پەرە دەستێنێ و هەموو تێک دەگەن .

بۆکان:**ئەبووبەکر خالندی**

. چەندپرسیارت هێناوەتەگۆڕێ کەوەلامەکانیان لەژێرەوە دەبینی :

١- نووسیوتە بابەتی وەک "شەڕی کراس" و "بووکی یەکشەوە" بە چ مەنزوورێک لە گۆواری سروەدادەگونجین.

برای خۆشەویست لە گووارێکی وەک سروە کە فەرهەنگی - ئەدەبی یە دەبێ تەنز وکورتە چیرۆک و بابەتی جوراوجور بنووسرێ تاخوێنەر لەگەڵ نووسراوەکاندا بتوانێ خۆی سەرگەرم بکا وشتێکیش فێر بێ . گۆوار ناتوانێ پڕبێ لەبابەتی زەق وسەخت و نائاشنا ولەگەڵ کتێبی دەرسی جیاوازی هەیە.

٢- ئەوەی کە لە نووسراوەکاندا زۆر باسی تەبیعەت دەکرێ ئەوەیە کە

کوردستان وڵاتێکی جوان و خنجیلانە ولەبەر دڵانە. ئەو جوانی ورەزاسووکی یە کار دەکاتە سەر نووسەر و شاعیرەکان بەڵام تەنیا نابێ لەبارەی تەبیعەت بدوێین وشیت بنووسین. ئێوە دەتوانن لەبارەی ئابووری هونەری دینی و گەل مەتڵەب بنووسن و بۆمان بنێرن

٣- ئێمەش ئەو نیازەمان هەست پێ کردووە کە باسی قافیەورەدیف وربازەکانی شیعر وپەخشان نووسین بکەین هیواداریب لە داهاتوودا ئەو کارە ئەنجام بدرێ.

٤- بۆشیعردانان زانینی ئوسوول وفەن و دەستوور و دەسەڵاتی ئەدەبی پێویستە شیعرێک هەستی خوێنەر دەبزوێنێ کە دەردی گەل باس دەکا وقسەی دڵی جەماوەری خەڵک دەکا و عیرفان و حەقیقەتیان پێدەڵێ.بەکورتی ئەوان بۆ لای راستی ودروستی رێنوێنی دەکا.

٥- کوردی خوراسان لە زەمانی شا سمایل وشا عەباسی سەفەویدا گوێزرانەوە خوراسان. ئێستاش بەکوردی بادینی (شکاک) قسە دەکەن و رێ و شوێن وزبلانی کوردی یان لەبیر نەچۆتەوە زۆربەیان شیعەمەزهەبن و زۆریان کوردستان خۆش دەوێ پێویستە (کتێبی حرکت تاریخی کرد بەخراسان - کلیم‌اللە توحدی) بخوێننەوە

مەهاباد: **رەسووڵ قادری نوور**

لەبابەت ژیانی حەسەن زیرەکەوە پرسیارت کردووە. بەداخەوە ئێمە بەسەرهاتی ژیانی ئەم هونەرمەندەگەورەمان لەدەست دا نیە.لێرەدا داوا لە تۆ و تەواوی خوێنەرانی بەرێزی سروە دەکەین ئەگەر بەسەرهاتێکی تەو وی حەسەن زیرەکیان هەیە بۆمان بنێرن تا دوای رای دەستەی نووسەرانی سروە بۆ چاپ ئامادەی بکەین.

نەغەدە: **محەممەدئیستقیلی**

ئەم بابەتانەی ئاشیرەت پێ کردوون بۆمان بنێرە دەیدەین بە دەستەی نووسەرانی سروە رای لەسەر بدا وئەگەر پەسند کرا لە چاپی دەدەین.

بۆکان: **محیەدین ئەحمەدی**

براگیان: نامەجوانەکەت گەیشت لە هەستی هاوکاریت سپاس دەکەین.

پرسیارت کردووە کە کتێبی کوردی بە ناوی "ئەسرار مەرگ" هەیە؟ ئەگەر هەیە نووسەرەکەی کێیە وباسی چ دەکا؟

لە وەڵامدا دەبێ بڵێین: ئێمە وەها کتێبێکمان بە کوردی نەدیوە و نازانین باسی چ دەکا.

نامە و دیاری ئەم ئازیزانەشمان بەدەست گەیشتووە سپاسیان دەکەین.

**نەغەدە:** سمایل شەریفی
**بۆکان:** کۆکان ئیسماعیل زادە
**بۆکان:** مەحموود فەرەجی
**مەهاباد:** تاهیر سەلیمی
**میاندواو:** بەهائەددین
**سەردەشت:** رەحمان میهرەبان
**سەقز:** هەژار فاروقی
**نەهاوەند:** ئەبووبەکر شادان
کەماڵ ئیسماعیل زادە ،رەسوول شەمسەددین ، ئەسعەد جەوانمەردی
**مەریوان:** فەرهاد محەممەدی
**شنۆ:** مینا زەرزا
**سەردەشت:** عەولا ئازەری
**سنە:** موختارشێخ حەسەنی
**سوما:** گوڵاڵە عومەری
**بانە:** ک .د. ئازاد
**مەهاباد:** کەماڵ فەتاحی قازی
**ورمێ:** ماموستاسەدرەددین
**مەهاباد:** م. ئاسیابان
**تاران:** فارووق سەفی زادە
**بۆکان:** ئاسۆ
**مەهاباد:** کەماڵ تەنیا
**بانە:** عەلی حوسێنی
**بۆکان:** سمایل قاسمی
**بۆکان:** محەممەد رەشید ئەحمەدی
**بۆکان:** شەریف عەرەبی
**بانە:** کەریم دافیعی
**پیرانشار:** سمایل سەید شکری
**پیرانشار:** قادر پیرەمێرد
**ورمێ:** مەقسوود بەلەدی
**ه.م.ج:** مەرگەوەڕ

هیچ گومانی تێدا نیە ئەگەر کاری هونەری و ئەدەبی نەکەوێتە ژێر باس و خواس و رەخنەلێگرتن ئەو جۆرەی پێویستە هەڵنادا و بێ ئاگا ورەنگە بەرەو هەڵدێر ولاڕێ بڕوا و تێدا بچێ. هەر لەبەر ئەوەش ئێمە (کاربەدەستانی گۆواری سروە) زۆر پێشوازی لە رەخنە وڕێنوێنی رووناکبیران و نووسەرانی خۆشەویست دەکەین ورەخنەکانیان بە بێ سێ و دوو لێکردن و دەست تێوەردان چاپ دەکەین و داوەری وهەڵسەنگاندنیش دەدەین بە خوێنەران. بەڵام بۆ ئەوەی رەخنەگریش تووشی لاڕێ و هەڵەنگووتن نەبێ و خوێنەریش وەک رەخنەگر دەڵێ "کڵاوی نەچێتە سەر" وپێی وانەبێ هەرچی رەخنەگر دەینووسی راستە و قسەی تێدا نیە.

بە پێویستم زانی جوابێک لەمەڕ رەخنەی رەخنەگری تەنزی "پەروەندە" بەکورتی بدەمەوە.

دووپاتی دەکەمەوە، رەخنەگرتن بەلای منەوە زۆر پێویستە ودەبێتە هۆی وشیاربوونەوەی نووسەر و سەرکەوتنی لە نووسیندا و هیوادارم ئەو جواب دانەوەیەم نەبێتە هۆی پرینگانەوەی دۆستان لە رەخنەگرتنی بەرێ وجێ و زانایانەیان.

رەخنەی هەرە گەورەی رەخنەگر لەتەنزی پەروەندە وەک خۆی دەنووسێ ئەوەیە کە: "نووسەر دەبێ قارەمانەکانی خۆی لەنێو کۆمەڵ هەڵبژێرێ ولەشوێن وکاتێکی دیاری کراودا دەکایەیان بێنێ ..."

ئەو فەرمایشە زۆر بەجێ یە. بەڵام بۆ من روون نیە کە قاچاغچی و دادیار وپاسەوان وهاتوچۆی زۆر لێکراوێکی وەک هەمەوەند و شوێنێکی وەک دادسەرا و دادگوستەری و قاوەخانە کامیان لەناو کۆمەڵ هەڵنەبژێردراون ؟! ئەو قارەمانانە کامیان لە مریخ یازوهرەوە هاتوون ؟! مەگەر رەخنەگر حەشیمەت و هات وچۆو تێکەوەهاویشتنی خەڵکی لە دادگوستەری و شارەوانی چاوپێ نەکەوتووەو نازانێ گرفتاری زوربەی ئەوانیش هەر ئەوەیە کە لە تەنزی "پەروەندە" دا باس کراوە ؟!

رەخنەگر ئەوەی پێ سەیرە کە نووسەر دەڵێ " پەروەندەیەک بە خەتی میخی، لە زەمانی هەخامەنیشی را لەبایەگانیدا مابۆوە!بۆروون کردنەوەی ئەم خۆشەویستە پێویستە بڵێم کە نووسەر حەقی موبالەغەی هەیە بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەر بە تەواوی بۆ مەسەلەیەک راکێشێ. ( بەوە دەڵێن Exageration) بۆ نموونە ئاورێک لە ئەدەبیاتی جیهانی دەدەینەوە و دوو سێ نموونە دەخەینە ژێر باس ولێکۆڵینەوە:

کافکا نووسەری بەناوبانگی چێکی لەداستانی " مەسخ"دا دەنووسی کابرا- " مەسخ"دا دەنووسێ کابرایەک شەو لەوەتاغەکەی خۆیدا لەسەر پشت راکشابوو فکری دەکردەوە. وردە، وردە زگی هەڵمسا وهەتا وەک

جالّجالّووکەیەکی زەبەلاحی
لێهات و...

جۆرج ئۆروێل نووسەری
بەناوبانگی ئینگلیسی کە
دەکرێ بە گەورەترین تەنز

و شیر دەخۆنەوە و سیغار
دەکێشن و بە قەمچی
ئاژەڵەکانی دیکە تەمێ
دەکەن وئیعلامیە دەنووسن
و بە نەردیواندا وەسەر

رۆمان هەیە. کەمایەسی
لەم بەستێنەدا رەخنەگر
تووشی هەڵە وسەرلێشیواوی
دەکا .

لە هێندی جێگا دەبێ

نووسی بریتانیای بناسین
لە کتێبی"قەڵای حەیوانات"دا
قارەمانەکانی بریتین لە
چەند بەراز و دوو ئەسپ
و کوێ درێژێک و ژمارێک
گا و مانگا و...

ئەم ئاژەڵانە لە دژی ،
خاوەنەکەیان شۆرش دەکەن
و سەر دەکەون و تەویلە
و مەزرا داگیر دەکەن .
پاشان شەڕی قودرەت لە
نێوانیان دا دەست پێدەکا و
زۆری پێ ناچێ دوو بەراز
بەسەر مەزرا وئاژەڵەکانی
دیکەدا زاڵ دەبن ودەست
دەکەن بە حکوومەت کردن .
هەڵدەستنە سەر پاشوو
رادەوەستن. وەک ئینسان
بە رێگادا دەرۆن و قاوە

دەکەون ودروشمی "حەیوانی"
لە دیواران دەنووسن و...

ئەوجار بڕو بڕوانە
مارک تواین تەنزنووسی
بەناوبانگ لە کتێبی
" دوانە سەیروسەمەرەکان"دا
موبالەغەی چۆن دەکا .

خودا روحمی بەوان کرد
نووسراویان نەدا بە سووە
نووسراوەیان نەدا بە سروە
دەنا رەخنەگر ئەوەی بەسەر
دەهێنان کە هەمەوەندبەسەر
عەبە قاچاغچی هێنا !!

دەبێ ئەوە بزانین کە
رەخنەگرتن لە چیرۆک و
داستان وتەنزی کۆمەڵایەتی
و بابەتی دیکە پێداویستی
بە موتالای هەراو وقووڵی
ئەدەبیاتی جیهانی بەتایبەتی

بۆ رەخنەگر " لە بنی
کولەکەی بدەی! " دەناحاڵی
نابێ ! بوونی پەروەندەیەکی
کۆن لە دادگوستەریدا
دەکاتە بەهانە ودەنووسێ:
"...نووسەر بایەگانی
دادگوستەری دەکاتەمووزە.."
ولە کوتایی دا دەڵێ :
" لە زەمانی
هەخامەنیشی دا کە نووسین
لەسەر بەرد وخشت وپێست
باو بووە ئەدی کاغەزیان
لە کوێ را هێنابوو کە
پەروەندەی کامبۆژیای لێ
بنووسن ؟"

دەبێ بڵێم "جَلّ الخالِق!"
لەبەر ئەو رەخنەیە!! وادیارە
هەرشتێکی لەسەر بەردوخشت
و پێست نووسرابێ یا

هەڵقەندرابێ ناکرێ بخرێتە سەر کاغەز ! ئەمن دەڵێم دەبێ و بۆ روون کردنەوەی رەخنەگر لەبنی کولەکە دەدەم ! "شکایەتی کامبۆژیا ٢٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر لەسەر بەرد هەڵقەندرابوو .مەسەلەن لە کۆڵینەوەی تەختی جەمشیددا دۆزراوەتەوە . پاشان عەکسیان لێ هەڵگرتووە و عەکسەکەیان خستۆتە سەر کاغەز و پەروەندەکەیان ناردۆتە بایەگانی دادگوستەری و بەردەکەشیان راگوێزتۆتە مووزە !

دیسان لەو رەخنەیەدا تووشی بۆچوونێکی زۆر لاواز دەبین . رەخنەگر دەڵێ عەبە قاچاغچی زگ زل ئەگەر وا کزە چۆن قاچاغچیگەری دەکا و پوولی خەڵک دەخوا . دیارە رەخنەگر لەسەر ئەم باوەرەیە کە قاچاغچی وەک رۆستەمی زەمانەیە و پلەی وەرەی بەرزە وزۆر ئازایە ! بەپێچەوانەی ئەم بڕوایە پێویستە بگوترێ ئەو کەسەی بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی روو لە کاری خراپ و دزی و درۆزنی و قاچاغچیەتی دەکا پلەی وەرەی زۆر نزمە .چونکە ناتوانێ شان وەبەر ئەرکی ژیانی شەرافەتمەندانە بدا و دژوارییەکانی قەبووڵ بکا . تەحقیقات و لێکۆڵینەوەی کارناسان لە زیندان و گرتووخانەکاندا نیشان دەدا کە قاچاغچی و دز و درۆ زن کە بیرو باوەڕی بنەڕەتیان نیە و وەرەیان زۆر نزمە و بە دوو هەڕەشە و گوڕەشە و هێندێک جەزرەبەدان هەموو رازێک دەدرکێنن . جا بۆیە راسان وداپسانی راستینی هەمەوەند دەتوانێ عەبە بخاتە لالانەوە وپاڕانەوە ..

نامەوێ زۆرتر لەسەر تەنزی "پەروەندە" بکەمەوە بەڵام شتێک بۆمن جێگەی سەرسوڕمانە! ئەویش ئەوەیە کە رەخنەگری خۆشەویستمان لای وایە نووسەری "پەروەندە" پاسەبان "مەمدەلی" تەنیا بۆ ئەوە هێناوە کەلەجیات "قانوون"بلێ " گانوون" و بزەیەک بخاتە سەر لێوی خوێنەر!! من خەریکم لێوم دەبنە پزوو ، چاویشم ئاوی تێدەگەڕی کە بگریم . بۆ دەبی رەخنەگر وا فکر بکاتەوە؟ بۆشی لە بنی کولەکە نادەم تا بۆخۆی هۆیەکەی بدۆزێتەوە ! .

بەلای رەخنەگرەوە سەیرە هەمەوەند بە قسەی پیری مەنگوڕ رادەپەڕێ و ئازا دەبێ ومافی خوراوی خۆی دەستێنێتەوە . تەنانەت بێزیشی لێی هەڵدەستێ ! پێویستە دیسان سەرنجی ئەو بەرەو ئەدەبیات رابکێشم لە هەزاران نەقڵ و داستان دا دەبینین کە قسەی دۆست یا دوژمنێک دەبێتە هۆی وەخۆهاتنەوە و راپەڕینی قارەمانی داماو کە ئەو راپەڕینە چارەنووسی دەگۆڕێ و دەبێتە هۆی سەرکەوتنی . لە شیعری " هەڵوی" خانلەری دا قالاو بە هەڵو دەڵێ دەست لە چیای بەرز بەردە و وەرە ، نزمایی ووەک ئێمە بژی .. بەڵام :

**راچەنی لەو قسەیە پیرە**
**هەڵۆ**
**هاتەپێش چاوی گەلێ**
**کەندو کلۆ**
**کەوتە ناوگێژی خەیالات**
**و خەمان**
**مان ئەگەر وابێ چ**
**شیرینە نەمان !**

هەروەها زۆر قارەمانی تاریخ وابووە بە بیستنی قسەی پیرەپیاوان راپەڕیون و تەنانەت دیتنی تێکوشانی بێ وچانی مێروولەش لە ناهومێدی رزگار کردوون و گەیاندوونیەتە ترۆپکی سەرکەوتن . مامۆستا هێمن بەبیستنی شیعرێکی مامۆستا هەژار ( هێمن ئەو بولبولە سەر بێ تووکە .... راپەڕی وبەرەو مەیدانی خەبات رۆیشت و .... جا نازانم ئەو چوابەی منیش دەبێتە هۆی راچەنینی کاکی رەخنەگر یا خێر !...

# حەسەن رەحیمزادە

ـ تکایە بەر لە هەموو شت خۆت بناسێنە .

ـ من حەسەن رەحیمزادە خەڵکی شنۆ ساڵی ١٣۴٢ لە شاری شنۆ لەدایک بووم فەوقی دیپلۆمی هونەرم لە تەربیەت موعەلیمی تاران وەرگرتووە و ئێستا دەبیری هونەری ئاموزش وپەروەرشی شنۆم .

ـ چۆن بوو هۆگریت بە وێنەگەری پەیدا کرد ؟

ـ من کوڕی جووتێرێکی نەخوێندەوارم، وەتێ چاوم پشکووتووە وێرای خوێندن لەگەڵ زەوی وزار و دەشت و مەزرا سەروکارم بووە . وەبیرم دێ وەختی بێکاری مەدرەسە لە مەزرا کارم دەکرد . وەختێک چام لێدەنا کەتری بدکە رەش دەبوو بەچیلکەو چاڵ چەند خەتم لەسەر دەکێشاوە . زۆر جار شتی سەیروەدەردەکەوت بەڵام لەبەر خاتری ئەوە کە شەرمێون بووم لە رووم هەڵنەدەهات بە کەسیان نیشان بدەم . دەنا هەر ئەوەدەم کەرەخنەیان لێ گرتبام وفێری وێنەگەریان کردبام ئێستا کارم لە جێگا یەکی دیکە بوو .

بەڵێ لە فێرگەش کاروباری وێنەکێشانەوەم وەستۆ [illegible] گرت و تەرح و نەقاشیم دەکێشا [illegible] خوێندندا دوو کەس زۆریان [illegible] بەکارێکی وێنە [illegible] یان دڵخۆش [illegible] " کاک [illegible] " [illegible] کاک "قادر [illegible] " [illegible]

ساڵی ۵۶ بۆ یەکەم جار [illegible] بە نەقاشی [illegible] بەڵام [illegible] جێگە بەکێشم بۆ کار کردن [illegible] لە ساڵی ۶۰دا چەند تابلۆی خۆم بە خەڵک نیشان دا .

نمایشگایەک نەبوو بەڵام
رۆژێکی تەحتیل کە دووکان
و بازاری خەیابان داخرا-
بوون چەند تابلۆم لە
قەراغ خەیابان دانا وویستم
خەڵک بێن چاوی لێ بکەن و
شارەزا رەخنەم لێ بگرن و
هەڵەکانم دەست نیشان
بکەن .

بەختەوەرانە خەڵک
پێشوازی یان لێکرد . زۆر
رەخنەی بەجێیان لێ گیرا .
ساڵی ٦٢ بۆ هەوەڵ جار
یەکێک لە هاوکارەکانم لە
لایەن هیلالی ئەحمەرەوە لە
موسابەقەیەکی سەرانسەری
وڵات لە تەورێز بەشداریم
کرد . لەبەر خاتری ئەوە کە
پوولی کرینی کەرەستەی
وێنەگەریم نەبوو ،نەمتوانی
یەکەم جەلەسە هاوبەشی
بکەم بەڵام جەلەسەی دووەم ،
بەشداریم کرد و مەقامی
هەوەڵم هێناوە . و دیپلۆمی
ئیفتیخاریان دامێ . ساڵی
٦٣ لە موسابەقەی وێنەگەری
وڵات لە مەشهەد بەشداریم
کرد و لەوێش پلەی دووەم
هێناوە ودیپلۆمێکی دیکەشم
وەرگرت .

- بەگشتی دەتوانی بڵێی
کۆسپی رێگای سەرکەوتنی
زۆرترت لە هونەردا چ بووە ؟

- جارێ شارەکە شارێکی
چکۆلەیە .کەرەسەی کەم
لێ وەدەست دەکەوت . منیش
هیچم بە جەرگەوە نەبوو .
جێگەیەک نەبوو کاری لێ
بکەم . کەمتر لەگەڵ هونەر-
مەندان شارەزاییم بوو. لە
هەموان گرینگتر، من زۆر
شەرمێون بووم و پێم وابوو
کارەکانم رووی مەجلیسیان
نیە . ئەوانە هەموودەستیان
دا دەست یەکدی و ببوونە

بەرهەڵستی پێشکەوتنم

- بە بڕوای تۆ وێنەگەری
چیە ؟

- وێنەگەری زمانێکی
تایبەتی هەیە وێنەگەر
بە زبانی رەنگ و تەرح و
خەت لەگەڵ جەماوەری خەڵک
دەدوێ ! وێنەگەری سەرکەوتوو
ئەوەیە کە بەو زبانە
دژوارە پەیامی خۆی بە
خەڵک رابگەیەنێ
وێنەگەریش هەر وەک شیعر و
ئەدەب دەبێ لە خزمەتی
خەڵکدا بێ و تا دەتوانێ
دەردی بەرەی مرۆڤ
بنەخشێنێ و پێشانی
بینەرانی خۆی بدا .

زۆرتر بەچی کاردەکەی ؟

- کارکردن بە رەنگ و
رەوغەنم زۆر بەدڵە چون
دەوامی زۆرترە و چاکتر
کاری لەسەر دەکرێ.هەڵبەت
بە ئاورەنگ وسیاقەڵەمیش
کارم کردووە بەڵام ئەوەی
مەبەستی دڵم بێ هەر بە
رەنگ و رەوغەن کێشاومەتەوە

سووژەی تابلۆکانت چن ؟

- سووژەی من خەڵکە .کار
وباری کۆمەڵایەتی و ژیانی
ئیمڕۆی شادەمیزادە .
هەڵبەت هەڵبژاردنی سووژە
بەستە بە چۆنیەتی ژیانی

بەڵام نەیتوانیوە بەتەواوی شلم بکاتەوە. قەت ورەم، بەرنەداوە و دەستم لە کار هەڵنەگرتووە. ئەو کەسەشم خۆش دەوێ کە رەخنەی بەجێ لە کارەکەم دەگرێ و رێنوێنیم دەکا

ـ هیوادارین بەئاواتە

وێنەگەرە. منی کوڕە جووتێر ناتوانم سووژەیەک هەڵبژێرم کە زۆری لێ دوورم ...

بە هەر حاڵ وەختێک سووژەیەکم بە مێشکدا هات بەوردی فکری لێدەکەمەوە.

چاکێکی پیرۆز هەیە بە نێوی "سوڵتان مستەفا" کەوتۆتە قەراغ شاری شنۆ. تابلۆیەکم هەر بەم ناوە گەڵاڵە کردووە، بۆکێشانەوەی ئەم چاکە دەبێ زاویەیەک هەڵبژێرم کە بتوانێ سامو هەیبەتی ئەو گۆڕستانە و ئەو چاکە نیشان بدا. مەبەستم ئەوەیە وێنەگەر دەبێ زۆر ورد بڕوانێ و لە هەڵبژاردنی سووژەدا زۆر وەستا بێ و زۆرشت وەبەر چاو بگرێ.

ـ تابلۆکانت ماون ؟

ـ زوربەیانم نەماون. دۆست و ئاشنا لێیان ستاندووم یا بۆخۆم پێشکەشم کردوون. بەڵام ئەوانەی بۆ دڵی خۆم کێشاونەوە هەر ماون

ـ بەناوی هونەرمەندێک چ ئارەزوویەکت هەیە ؟

ئارەزووم ئەوەیە تاقە وەتاغێکی تایبەتی وێنە گەریم ببێ و لە باری ماڵیشەوە ئەوەندەم دەستە ـ لات ببێ هونەرێکی باشتر پێشکەش بە خەڵک بکەم. هەڵبەت من وەک لە پێشدا گوتم دەستەنگی و نەداری زەبری لەکاری هونەریم داوە

کانت بگەی. ئێمە ش داوای سەرکەوتنت بۆ دەکەین.

ـ منیش پڕ بەدڵ سپاسی ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کورد دەکەم کە بۆ ناسینی هونەری خۆماڵی لە حەول دایە ....

بەهار جوانە، خۆشە، لەبەر دڵانە، خو ناوەی بارانی، رەهێڵە و تریشقە و گرم و هۆڕی هەورەکانی، بۆن و بەرامەی چیاودۆڵ ولاپالانی، قاسپەی کەو و چریکەی بولبول و کێشەوەی باڵندەکان بۆهێلانە سازکردن و هۆهۆی جووتیار، دیمەنی تەواونوێن وچیمەنی نەخشین و لێمشتی فرمێسکی رنووی رندۆڵانی، لووزەوەی بەفراوی ئاوهەڵدێرانی، چادرو چیغ و هەوار و کۆچ و کۆچباری، کام شاعیر و نووسەژوخاوەن هەستهاتووە و رۆیشتووە و جارێکی بەدیمەنی دڵڕفێنی بەهاردا هەڵنەگوتووە و گڕو بڵێسەی دەروونی دەرنەبڕیوە؟ بەهار جوانە، چون سەرەتایە پاکە، بێگەردە. هەموو شت نوێ دەبێتەوە، سیا سووتە و سفرەی نەخشینی بەهار بەرەو کرانەوە و راخرانە، دەبا، نە، بە زمانیکی ئەدەبی بەڵکوو بە راوێژێکی خۆماڵی بدوێین و سەبارەت بە گۆشەیەک لەو هەموو جوانی ـ یانەی دێنە بەرچاو، بەو مەرجە بیر بڕکاوچاو هەتەر کا و دڵ خەتەرەی نەکەوێتێ هیچ شتێ لەو بارەدا لە قەڵەم ناخەین و کوڵی دڵی خۆمان بەیادی چەن وشەی کۆن و رەسەن هەڵدەڕێژین و لەو کوێستانە سەربەرزو کۆمەڵە شاخە سەختو گەردەنکەشانە یادێک دەکەین ئەوەی ئاشکرا و روونە لە رابردوودا تەنانەت کۆچ و کۆچباز و بەکورتی ژیانی کۆچەری لەشارەکانیشدا داب بووە. بۆنموونە خەڵکی شاری گەورەی سنە، هاوینی خۆیان

لە دەوروپشتی کانی شفا رابواردووە. ئەورۆ لە زوربەی هەرێمەکانی کۆچەری مەگین لەنێو مەڕدارەکان کە بە بیانووی بانەمەڕ دەنا وردە، وردە بە تایبەتی لە شارەکان فەرامۆش کراوە..هەر بۆیە لێرەدا ئاماژە دەکەین بەهێندێک لەو شتانەی کە پێویستی ژیانی عێلاتین و ئەوەی دەمانەوێ بیڵێین مقەستی دەکەین، چونکە قسە هەزارە و دووی بەکارە.

**مەبەست لە چوونەهەوار:**

بێ گومان زۆر شت هاندەری ئینسانە بچێتە هەوار و ماوەیەک هەوایەکی ئازاد هەڵمژێ، ئاشکرایە ئاخری زستان بە تایبەتی مانگی رەشەمە کێچ وزیندە ـ

وارەکانی دی وە جم و جووڵ دەکەون.

لە رابردوودا ئەو دەرمان وشتە لە گوڕێدا نەبووە تا پەربەرەکانی یان لەگەڵ بکەن. لە لایەکی دیکەوە بە هۆی ژیانی ئاژەڵداری و وەبەرچاوگرتنی هەوای تایبەتی کوردستان کە زوو دادێ و مەودای گەرما کەمە خەڵکی ئەو ناوچەیە ناچارن بیانبەنە جێ یەکی بژوێن و لەوەڕ خۆش و بێچووەکان بە دمی خۆیان بلەوەڕێن و ببووژێنەوە و رسقی پێویستیان ڕەعەمەل بێنن و مەڕ و مالات لە هەوایەکی ساوو لەوەڕگەیەکی سازگار هەڵبزوقێنەوە. بە نیزیک بوونەوەی وەرزی گەرما مێش و مەگەس ژیان لە ئاوەدانی تاڵ دەکەن بۆیە دەچنە جێ یەکی ئاواڵە و مێرگ و مێرغوزار وپێدەشت و قەراغ چۆم وئاو، پێم شک دێ لە دێی وەک دۆڵەتوو، ئی و هەیە هەر تەقە سەرێکیشی مالاتنیە بەڵامهەر کە بەهار داهات وێڕای گەلێ دەچێتە هەوار. **هەوارگە** (جێ هەوار) دەبێ گۆڕ و (راوەند) بێ. ئەگەر وانەبێ ئەوجێیە لەبەر پەسێرێکی هەلکەوتبوو جێ تاوڵ و کەپر گۆڕ دەکەن و ئاوی لێ دەپرژێنن و دەی شێلن، لەبەر پەسێران بە عام ڕووی تاوڵ دەلێژایی دەکەن. جێگای چیمەن بۆ هەوار پەسندە.

ڕەشماڵ = تاوڵ = دەوار= یا ڕەشمال = یا = دەوار.

بەپێی پێداویستی هەوارچی و دەست ڕۆینی ئەو گەورە و

چووکی هەیە. تاوڵی نێونجی کە پەسند وادابە، "سێ چەڵەکە" یا " سێ ئەستوندەک" یا "سێ کۆڵەکە"یەبۆ هەڵدانی بەلانی کەمەوە پێویستی بە دوازدە، سینگ و ڕستە و سێ چەڵەکە و چەند بەرچەڵە هەیە، چادری سێ ئەستوند شەش کوێنە،کە سێ سێ دەکەونە ئەو دیووئەو دیوی چادر.

سینگ : بۆ هەررستەیەک. سینگێکی سەر **بەدمک** یا سەر بە **هێچک** پێویستە، سینگی بە دمک سەری بە قولاپە یا گەڕانکی هەیە تاوەختایەکی ڕستەکەتاوڵیان لێ هالاندڕستە هەڵنەمالێ. کوتکی دار بۆ داکوتانی سینگەکان پێویستە سینگی بە گەڕانک:مەبەستلە سینگێکە کە"لەلە" کرابێ لە بڕێک شوێن لەباتی سینگ گوڵمیخ دادەکوتن.

**ڕستە :**

بەو گوریسانە دەڵێن کە سەرێکیان لە چادروسەرەکەی دیکەیان لەسینگەکانی ئالاون هێندێک بۆ قۆزایەتی و خۆ ڕانان، گوریسی ڕستەکان لە بەنی نەخشین دەهۆننەوە.

ژمارەی ڕستەکان هەتا پتر بێ چادر باشتر رادەوەستێ و لە بەرامبەر با و باکوتدا خۆراگرتوو دەبێ.

**قوڵفە ڕستە :**

قوڵفەی موویین لەحاستی جێ ڕستەکان لە چادرەکە چندراون یا دراون، ئەستووری وان بەئەندازەی ئەستووری ڕستەکانە.

**سەر ڕستە :**

گوریسێکی ئەستووری سەر

بە هێچکە کەلەدوای هەڵدانی چادر بەسەر ئەستوندی نێوە راستی دادێنن و دوو سەری لە عەرزی قایم دەکەن تا لە کاتی باو باسریچکدا ئەنگووچەڵەکان لە کڵاو رەشەکان تلاسا نەبن و چادر لە جێی خۆی هەڵنەقەندرێ.

**کڵاو رەشە :**

هەر ئەستوندەکێک سەری بە "ئەنگووچەڵەیە" لەحاستی ئەو ئەستوندەکانە، کون لە چادر کراوە و پەتکێکی بە قوڵفە بەسەردا هاتووە. کاتێک ئەستوندەکیان وەبەر چادردا بەنووکی ئەنگووچەڵەکانەوە دەگیرسێتەوە. جاری وا هەیە بە قوڵفە قەناعەت ناکەن و وەک کڵاو دەیچنن و

لەسەر ئەستوندەکان قیتی دەکەنەوە، کڵاو رەشەی پێدەڵێن. جاری واشە لەدەرو ژوور بە گوڵینگی رەنگا و رەنگ دەی نەخشێنن و دەڵێن ئەو تاوڵە سوربە ژەنگارە.

**چەڵەکە :**

چەڵەکە یا کۆڵەکە یا ئەستوندەکدارێکی درێژە و پێوەندیبەگەورەوچووکی تاوڵ هەیە. ئاشکرایە هەتادرێژتر بێ نێوتاوڵ چووکتردەبێتەوە ئەوسەری کە رووی لەحەوایە دوو پەلە تا بەکڵاورەشەوە بگیرسێتەوە، خوارێشی وەک مەزرەق وایە بۆ وەی باشلە عەرز جێ گیر بێ.

**لیسک :**

بۆ هەڵاوەسینی زۆر شتان لە تاوڵ و کەپردا پێویست بە سینگی تایبەتی هەیە. لەبەر ئەوەی ئەگەر چەڵەکە یا بەرچەڵەکان پەلێکی رووبە حەوایان پێوەبێ نایبرنەوەو بۆ شت هەڵاوەسین کەلکی لێ وەردەگرن.

**بەرچەڵە :**

بەرچەڵە یا بەرچەڵەکەلە چەڵەکە باریکترە، سەری هەر وەک چەڵەکە دوو پەلە. بۆ هەر چوار لاپانکان "بەرچەڵە" پێویستە. لە دیوی دەرێرا دەچن دەبەر رەستەکانەوە چونکوو دەبێ پێشی تاوڵ لە پاشی تاوڵ بلێندتر بێ. رستەکانی پێشەوە بەجێی دەرکەن بۆیە بەرچەڵەیان وەبەر دەدەن تا لە کاتی گەرمادا بەهەڵێنانی وان چادر حەوا درێ وژوورفێنک بێتەوە.

**تاوڵ هەڵدان :**

لەپێشدا چادر لە جێی تاوڵی پان رادەخەن ئەوجار لە دوولا پانک ونێوەراستی - را سێ کەس چەڵەکەکانی وەبەر دەدەن وبلێندی دەکەن بەو ئەندازەی ئینسانی دەبەرەوە بچێ. چەڵەکەکان دەبەن هەتا ئەنگووچەڵەکان دەبەر کڵاو رەشەی دەنێن هینگی وێگرا قەوەتی دەدەنێ چادر قیت دەبێتەوە. لەو کاتەدا ژن و ژاڵ لە سەر سینگ و رستەکان حازرن و دایاندەکوتن. چوار سینگی لاپانکەکان دەبێ لەپێش هەموو سینگەکاندا بکوترێن، ئەگەر دوای ئەوەی سینگەکانیان داکوتا تاوڵ گنجی کەوتبێتێ جێی سینگەکان دەگۆڕن، لە پاشان چیغی بە دەرەوەی چەڵەکە پانکەکان رادەنگێون بۆ وەی راوەستێ. هەر دوو گەز، دوو گەز، بەرچیغان لە کەمەرە چیغەکان (بەن

چیغ ) رادەکەن ولەعەرزیان دادەکوتن .

**بەرچیغ :**

سەختەدارێکی جەنگەڵی ( بەرووـ مازوو ) بەدرێژایی گەزونیوێکی وەک دەسکە پێمەرە وایە بەلام سەرێکی دادەتاشن تا لە عەرزی دابکوترێ .

**لامێردان :**

ماڵێکی میوانی زۆر بێ و دەستی نەروا دوو تاولان هەڵدا یا ئەوەی کوروبووکی لەگەڵ بێ چیغێکی وەک ، تیغەی بەنێو تاوڵێ دادێنێ. بەوجۆرە تاوڵەکە دەبێتە دوو بەش ، ژن و منداڵ لە لایەکی تاوڵێ دەبن ولایەکەی دی دەبێتە بەری میوان کە ( لا مێردانی) پێدەڵێن .

**قووڵ ئاور :**

جێگایەکی بۆ ئاورگ لە نێوەراستی ژووری تاوڵ لە عەرزی دیاری دەکەن وهەڵی دەکۆڵن و لە پاشان جوانی قور دەدەن و دەی سوونەوە دەبێتە قووڵ ئاور ، سێ بەردی لەدەوری دادەنێن ئەوانیش ناویان (کوچک ئاور ـ گ"ه) بۆ نان کردن سێڵی لە سەر ئەو بەردانە دادەنێن بەلام بۆ ئاوو شێووەسەرنان سێ کوچکە هەیە

**هەرزاڵ :**

شتێکە وەک چوارپایە بنی کللۆرە وەک خانووچکەی منداڵانە ، حاجەت وشرۆشاڵاتی زیادی لەوێ دەنێن و ماڵی پێ هەڵدەوێژێرن ، سەری تەختە ودەستەنوێن وپێخەفی لەسەر کەڵەکە دەکەن ، بۆ سازکردن بنی چوار داری دوو پەل بە قەدپاڵێکی بە چوار گۆشە توند لەعەرز قایم دەکەن لەپاشان لەدرێژاییرا دوو داری وەک چەڵەکەی پێرادێرن تا دوو کێلیژیەک لەپاش و یەک لە پێشەوە ساز دەبێ، ئەوجار ئەوبەرەو بەر قو لەداری داوێنێ .بەو جۆرە هەرزاڵ ئامادە دەبێ بۆجوانی بەرەیەکی خۆش نەخشی پەنجەکێشی بەسەردا دەدەن.

لە رابردوودا ماڵ نەبوو بەرەی خۆی بۆخۆی ساز نەکا .

**پێرگ :**

جاروبار لەحیاتی وەی هەرزاڵی بە قوڵەداران هەڵبەستن یا لە پانایی هەرزاڵ دوو قوڵە دیواران هەڵدەچنن و داری داوێنێ ئەوجۆرە هەرزاڵانە ناویان پێرگە و ئەو بەرەی پێی دادەپۆشن (بەرپێرگی) پێ دەڵێن .

**کولێن :**

بۆ راگرتنی رسق و بە تایبەتی رۆن لە هەوار جێ یەکی فێنک لازمە ،هەربۆیە قووڵکەیەکی لە قولینچکی تاوڵ بەومەرجەی سێبەر بێ و تاو تێی نەکا هەڵدەقەنن بە ئەندازەیەکی ئینسان بتوانێ بە ئاسانی تێیدا هەڵسوورێ. ئەگەر ئەوماڵە دەوڵەمەند بێ ورسقی زۆر بێ قووڵی کولێن گەورەتر هەڵدەقەنێ . ئەگەر خاکی جێ کولێن رووخەک بێ لەنێو قەدی دیوارەکانرا بۆ لای سەرسەنگ چنی دەکەن و قوڵە داری داوێنە سەر وبەرەو جەوالان دایدەپۆشن ، لەو جێ یانەی نیزیکە شارن و رسقی بۆ ماوەیەکی زۆر راناگرن،رسقیان لەپشتت پانکێ،یانی لە دەری تاوڵ دادەنێن.

تاوڵ دوو پشتپانکی هەیە بەیانان لایەکی وئێوارانلایەکەی دی فێنکە .بۆیە ناچارن رۆژێ بەلانی کەمەوە، جارێک رسقەکەیان بگوێزنەوە

# م.وفا

خۆشەویستم
گولّی جوانم ،
ئەوینم
ئارامی گیانم
هەروەک مۆمێک
رۆشن دەکەی شەوی رەشی ژیانی من
گەرم دەکەی لەشی ساردی خەزانی من
مۆم .مۆم!!
نا ،نا هەڵەم کرد ،بم‌بوورە !
مۆم کوا دەتوانێ وەک تۆبێ؟
ئەتۆ مانگی شەوی زەوی رووناک دەکەی
ئەتۆ رۆحی بۆلەشی من،
ئەتۆ رۆژی هەموو هەردێ گەرما دەدەی.
گولّم تەنیا
ئەوینی تۆبۆ پەپوولەی ژیانی من
وەک مۆمێکە
دەمسووتێنێ
بەلاّم گوتم
منیش وەکوو هەرپەپوولێک
ئەوکاتە خۆشحاڵ ورازیم
کەلەئاگری ئەوینتدا
هەڵپڕووزێم ،
هەموو رۆژێ
هەمووشەوێ
هەمووساڵێ
چ بت‌بینم
چ نەت بینم
لەبەرچاومای
لەناودڵمای
لەناوگیانمای.
تۆخوا گولّم
ئەتۆش جارجار
یادێک بکە لەو پەپوولەی
شەمی ئەوین
باڵەکانی هەڵپڕووزاند.

# تاڤامن پ.ج.هێڤی

ئەز هەیڤاسارم تو تاڤی بۆمن
ئەز عەردێ حشکم تو ئاڤی بۆمن
ئەزلەش وتەرمێ ڤک وڤالامە
توجان وجیگەرهەناڤی بۆمن
ئەز ل بەرۆژا گولەک چلمسی
تودانێ سبێ خوناڤی بۆمن
ئەز تەک وتەنێ بێ یارو بێکەس
توخزم وکەس وهەوباڤی بۆمن
شووشا شکەستی لبن خولیێمە
تو بێهن وعەترو گولاڤی بۆمن
ئەز بیێ تە گولێ بەزر ناڤەکم
توجانێ نیشان خۆناڤی بۆمن
ناڤ تەم ومژێ باسکم شۆر بوویە
پێشەنگێ چیایێ مژاڤی بۆمن
ئەز پەرشکەستی، مامەبندەستی
تو پەروباسک وپێگاڤی بۆمن
ئەز سۆمەکارێ گۆلا بێ بنم
تو زێرەوانێ تۆر، داڤی بۆمن

# لەگەڵ شیعری

ئەز گۆلا بێ ئاڤ ل بەستێ مامە
توئاڤ وپێلاڤ ، گەراڤی بۆمن
زەڤیا تاڤ سوتی یا زۆرتینیمە
خاکاڤ وپاکاڤ داناڤی بۆمن
ئەزبێدل وگول ،بەندەک ل سەرمل
تودل و وێریان ،زراڤی بومن
دەما دووراتی وبێکەساتیێ دا
توجانێ ویشت وسلاڤی بۆمن
ئەز وەک سێڤی یا چاڤ ب هێسرم
دایێ ئەز گۆری توچاڤی بۆمن
هەرچەند ل ژینێ بێ (هێڤی)مامە
توهێڤی یا ژینا هەرگاڤی بۆمن

# شاعیرانی لاو

## هەردێمەوە

ع. تیشکان گەرمیانی

ئەوینەکەم !
هەمووشەوێ، لەدووروڵات
مۆمی لەشم
بەئاگری یادی تۆوە ئەتوێنمەوە ،
بەئارەزووی بینینەوەت
بێ کەس ودەر
وەک مارەنگاز ئەتلێمەوە .

* * *

هەرکەبینیت :
کۆگە بەفری نێوکووچەتان
وردەوردە ئەتوێتەوە ،
دارەپیرەی نێو حەوشەتان
ئارامئارام ئەشنێتەوە ،
دڵنیابە یادم کردووی
بەدەم ئاخ وهەناسەوە
بەدەم هەزاران تاسەوە........

* * *

هەرکەدیتت :
قازوقورینگ
قەتار قەتار لەگەرمێن راگەڕانەوە
گوڵی سووری نێو باغچەتان
بەدەم شنەی نەرمی بەیان لەرانەوە ،
دڵنیابە بەڕێمەوە
چاوەڕێ بەهەردێمەوە
هەردێمەوە..........

* * *

بێ شک لەسەر گوێسوانەتان
گرمەی غەزەب کۆترەکانی تاراندووە ،
کوندەبووی شووم
بەئێسقانی منالەکان هێلانەکەی خۆش کردووە .
سەد هیندەی تر رێ تاریک بێ
هەڵدێر ورژد وباریک بێ
هەردێمەوە .

من دڵێمەوە ، تا پێت بڵێم :
هەرمنالێ، کرچ وکالێ
بیرلەمردن نەکەیتەوە

* * *

بەهارەکەم !
دارەکانی ئەم هەرێمەش
چرۆ وگوڵیان دەرکردووە ،
دەشت وپێ دەشت ، دۆڵ وچیا
بەرگی سەوزیان لەبەر خۆ کردووە ،
ئەما ، نایە
دەنگێکی تەڕ ، لەهیچ لایە
جریوەیەک تریقەیەک ،شنەی بایە .
سرتە رازێکە بێ بنە
روانین پڕئاخاوتنە .
کەسێ وەک من
کەپەروەردەی گاڵەی شەماڵ
سیڕاندن وقاسپاندنە ،
باش دەزانێ - بێ دەنگی جۆرێ مردنە-
بەپرشنگی چاوەڕوانیت
رێی تاریکم رووناککەوە !
بابێمەوە ،
تاکوو بەهار بەخەملێوی
لەچاوتدا ببینمەوە.
بابێمەوە ،
تالەگەڵ تۆ
لەسەر بستووی هەوارگەی سوور
پڕ لەچنوور ،
لەبەستێنی چەمی خوڕێن
کانی بلوور ،
لەگەڵ رێژنەی ئاسۆگی دوور ،
بەئاهەنگی تاسەوئەوین
شیعری ئومێد ،
سروودی ژین بخوێنمەوە !......
چاوەڕێ بە ،
دڵنیابە ، هەردێمەوە
هەردێمەوە
هەردێمەوە.....

# ڕێوێنی ئەدەبی

**کاک بێ سووچ**

شیعر تەنیا وەزن وقافیــە نیە .بەڵکوو ئەوەی دەبێ زۆر سەرنجی بدرێتێ نێوەرۆکـە . وەختێک دەڵێی :

**شەونم پرژێنە دەمـــی بەیانە**

**شەونم پرژێنە دەمـــی بەیانە**

یانی چی ؟

**دایک مەمکی دام وەک یەک موسڵمان**

کوێی شیعرە ؟ چ هەستێکـی شاعیرانەی تێدایە ؟

بەکورتی شیعرەکـەت لاوازە و پێویستیت بە موتالایەکی پتر هەیە . شیعری شـاعیرەکـان بخوێنەوە .حەول بدە بابەتـی نوێ لە شیعردا رەچاو بکەی.

مەهاباد : **کەماڵ کۆکەیی**

شیعرەکانی خوالێخۆشبـوو مەلا مارفی کـۆکـەیـی مـان پێگەیشت .شیعرەکان بەهەڵـە نووسرابوونەوە وزۆر جێگامان بۆ ساخ نەبۆوە. تکـایـمە ئەگەر بۆت دەکرێ سەرگور ـ یشتەی ئەم شاعیرە گەورەمان بەتەواوی بۆ بنووسە وچەنـد نموونە شیعری رەگەڵ بخـە تا لەسروەدا بە نـاوی خۆت بڵاوی بکەینەوە .

گەرمسار : **شاهۆ ـ ح**

شیعرەکانت زۆر لاوازن . لـەباری وەزن و قافیەوە لەنگن

بۆکان :**غەریب**

سووژەی شیعرەکەت خـراپ نیە .بەڵام باسەکانت زۆرلێک بڵاون وهێندێک جارمانا شیـان نایە .چەند تەعبیری نابەجێ نێوئاخنی شیعرەکەت بووە . بۆ وێنە :

**بێ وەفائیت لەگەڵ کردم**
**پێم نـاخـۆشەقەولی درۆ**
**نەتکرد پەسن گیانی بێتین**
**جوابت کردم وا بە دهـۆ**

گیانی بێ تین یانی مردوو. پەسن = موناجات

جابرانە مانای شیعرەکـەت. دەبێ بەچی .

وەزنی شیعرەکەشت لەچەنـد جێگا تێک چووە .

هەستێکی پاراوت هـەیـە . هێندێک وردبوونەوە وموتالای دەوێ . تۆزێک خۆماندوو بکـەی دەتوانی شیعری باشتر بڵێی .

سنە : **ف ـ وەیسی یان**

شیعرەکانت زۆر کز وبـێ هێزن .

**خەم وبرا** نابنە قافیە .مانای ئەم میسرەعە نایە .

**دونیا سەردوخاموش ودەریام لەیل بوو**

دیسان شەو هاتۆ برا

هەمتر رووی داوە شەوێکی پڕ خەم

لەباری کێشەوە یەکنین .

دەبێ بۆئەوەی ببـی بـە شاعیر وبتوانی شیعـر بڵێی گەلێک موتالا بکەی .حـەول بدە بابەتی نوێ وسووژەی تازە هەڵبژێری .

سەردەشت : **غەمبار بێورانی**

شیعرەکەت لەباری وەزن و قافیەوە لەنگە . بۆ وێنە :

**نازانی چ باس و چ**
**خەبەرێکە ئیمرۆ**
**قەرنی بیستەمە وبێ**
**هەولە ئیمـرۆ**

لەباری وەزنەوە نارێکـە و هەوڵ وخەبەریش نابنەقافیە

**شیعری نارێکم تەواوکرد ئیمـرۆ**
**دەسا برایان قەبـوو ڵ کەن لێمان**

هەم لەباری وەزنەوە هـەم لەباری قافیەوە لەنگە ...

مەهاباد: **سولەیمان ـ خ**

براگیان هەستی شاعیرانەت

هەیە. دەتوانی بەموتالای زۆر وشارەزابوون بە فەننی شیعر شیعری باش بلێی . بەلام ئەوەشبزانە شیعری نوێ وەزنی هەیە هەرواش نیە کە چەند وشە لە پەنا یەک ریز بکرێن ورستەی کورت و درێژ ساز بکەن .بۆوەزنی شیعری نوێ دەبێ موتالا بکەی. بە هیوای خوا لە ژمارەکانی داهاتوودا لەسەر ئەو باسە لەسروەدا دەڕۆین و بۆ رێنوێنی شاعیرە لاوەکانمان باسی شیعری نوێ درێژە دەدەین

گەرمسار : **شاهۆ ـ ح**

شیعرەکەت بەر لەهەموو شت لەباری وەزنەوە لەنگە . شیعرەکان هەر یەکە وەزنێکیان هەیە وەک :

**عەینی پەپوو وان بە**
**دەوری گرەوە**
**هەریەک بەجۆرێ لەبۆت**
**ئامان دەکا**

یەکە و دوای ئەمەش شیعرەکانت ماناشیان نیە . وەک :

**سانع ونازمی گشتی هەر**
**تۆی**
**بۆیە ناتۆرێ ولالەزامان**
**ئەکا....**

خانێ : **عومەرشێخ محەممەدی**

شیعرەکانت نێوەرۆکێکی جوانیان هەیە بەلام لە باری فەننی شیعرەوە لەنگن وەک : هەست ودەست چەند جار بوونە قافیە. دەبێ بزانی کە وشەیەک لەشیعردا جارێک دەبێتە قافیە. (**کۆمەنیست و هەست**) نابنە قافیە

پێویستیت بە موتالای پتر هەیە حەول بدە دەبی بە شاعیر.

خانێ :**هەیبەتوللا شامخی**

شیعرەکانت هەستێکی جوانیان تێدایە بەلام لەباری کێش و قافیەوە کەموکووڕیان تێدا دەبیندرێ بۆ وێنە :

**(تێکرایی وئەوینی) ، (غەمی ودلی) ، (تەمی ودلی) ، (سەری و دلی)** نابنە قافیە.

لەهێندێک جێگەش لە مانای شیعرەکە نەگەیشتین وەک :

**ئەوە دیسان شەوی تاریک**
**لە من هات**
**کەبوزگوڕێ لەمن دادرێ**
**تەمی من**
**من وتەموا غەریبین وکز**
**و مات**
**کەبەلکوو تۆتەکەی بگرێ**
**دلی من**

هیواداریـن بە موتالا و ورد بوونەوەیەکی تەواو هەستە جوانەکەت لەقالبی شیعردا بدرکێنی .

مەریوان : **فاتح وەیسی**

شیعرەکانت لەبەر ئەوە کە کەموکووڕی تێدایە بۆ چاپ نابێ .

**(میللەتانی و هاتوانی )** قافیە نین چون ئەگەر پاشگرەکەیان لاچێ (**میللەت و هاتوو**) دەمێنێتەوە کەنابنە قافیە. ئەوجار مەبەست لە شیعر هەر ریزکردنی وشە نیە دەبێ ماناشی تێدا بێ وەک :

**ئەگەر بتزانی وشەی**
**زانیاری**
**هەرکەس ئەت زانێ**
**بۆئەوگولزاری**

هیواداریـن شیعری جوانترمان بۆ بنێری .

مەهاباد : **عەلی رەمەن**

جارێکی دیکەش وەلامی ئەم پرسیارەمان داوەتەوە. بەلام ئەمجاریش دووپاتی دەکەینەوە **ک و گ دوو پیتی ئەلف و بێی کوردین ئەگەر لەپێش "ی" و "ێ" "وی" و "وێ" دابێن راوێژەکەیان دەگۆڕێ. بەلام لە نووسیندا هەر وەک خۆی دەنووسرێ وەک :**

**کوێ ـ گوێ ـ کۆ ـ کێو ـ گێوژ**

بۆکان : **جەعفەر عەلیزادە**

شیعری مندالان زۆرتایبەتی سەربەخۆی هەیە. دەبێ بە زمانی مندال بێ وشتێکی لێ فێربێ. وشەی قورس و نالەباری تێدا نەبێ .

ئەمشیعرەی تۆ ئەو تایبە ـ تی یانەی نیە وەک :

**کاتێ پاروو ئەگلێنم**
**دمو لێوم ئەنووقێنم**

لەباری وەزنەوە زۆر لەنگە تکایە ئەم کتێبانەی لەبارەی شیعرو چیرۆک بۆ مندالان نووسراون بخوێنەوە.

چاوەروانی بەرهەمی جوانتری تۆین .

# چارەنووس

چیرۆک بۆ منداڵان

کابرایەک ژنێکی دەبێ هەموو ساڵێ ئەو ژنە منداڵی دەبێ. منداڵەکەی ناگاتە سەری حەوتووی دەمرێ. رۆژێک سوڵتان مەحموود و هەیاس رێیان دە چادری وان دەکەوێ و دەچنە ژوور. سڵاو دەکەن و دادەنیشن. ساحێب ماڵ بەخێرهاتنیان دەکا. پاش نانوچا خواردن ئەو بەسەرهاتیان بۆ دەگێڕێتەوە. ئەزقەزا ئەو وەختی ژنەکە سەروبەندی منداڵ بوونی دەبێ. ساحێب ماڵ پێیان دەڵێ ئەمن ئەوەندە مەرەوەدەمێ بەو مەرجەی حەوتوویەک کێشک لەم منداڵە بکێشن. ئەوانیش دەڵێن باشە.

ژنەکە منداڵی دەبێ هەر شەوێک هەیاس و شەوێک سوڵتان مەحمود کێشکن.

ئەزقەزا شەوێک کە هەیاس کێشکێ دەکێشێ. تەماشا دەکا شتێک دێ سەیری وانیە. دندووکی بستێکە ولاقی باریک و درێژە و لە حاجی لەگلەگی گەورەترە. هەیاس زۆری لێ دەترسێ لە ترسان خۆ لە کەلێنێکی چیغەکە حەشار دەدا. دوایە ئەو دەعبایە دێتە ژوور، دێ کە دندووک بە منداڵەکەدا هەیاس لە پشتەوەرا هەرچۆنێکی بێ بە ترسە ترس و لەرزەلەرزە هەردووک لاقی دەگرێ و لێی دەپرسێ ئەتۆ چکارەی و بۆچی هاتووی. دەڵێ ئەمن چارەنووسم. لێمگەرێ. هەیاس دەپرسێ چارەیکێ دەنووسی. دەعباکە جواب دەداتەوە چارەی کچی سوڵتان مەحموودلەوکوڕە دەنووسم. هەیاس لێی دەگەڕێ و چارەی کچی سوڵتان لەو کوڕە دەنووسێ و دەعباکە دەڕوا. هەیاس شەوێ بە رۆژ دەکاتەوە و هیچ دەنگێ ناکا حەوتوودوایی دێ و سوڵتان و هەیاس کێشک کێشان وەردەگرن و دەڕۆن. کەمدەڕۆن، زۆردەڕۆن، هەیاس خەندێکی دێتێ. سوڵتان دەڵێ ئەو خەندەیە چ بوو هەیاس.؟

هەیاس دەڵێ قوربان هیچ نەبوو. سوڵتان دەڵێ ناشتێک هەر هەیە پێم بڵێ. ئەویش دەڵێ ئەمن قەرەوڵ بووم چارەنووس هات چارەی کچی تۆی لەو کوڕە نووسی. دەڵێ با بگەڕێینەوە و کوڕەکەی لێ بکڕین و بیکوژین. هەیاس دەڵێ قوربان ناکرێ و نابێ، چۆن منداڵێکی ساوا دەکووژی، سوڵتان دەڵێ، هەر دەبێ بگەڕێمەوە. دەگەڕێنەوە دەچنەوە ماڵی کابرا. بە کابرای دەڵێن کوڕەکەت نافرۆشی. دەڵێ وەڵڵاهی خۆ ئەو منداڵە هەر بۆمن نابێ

با پێیا ن بفرۆشم .وبە هێندێک زێر پێیـــا ن دەفرۆشێ .سوڵتا ن وهەیا س کوڕەکـــەی دە س. دەدەنـــێ ودەڕۆن.برێک دەڕۆن سوڵتا ن دەڵـێ: ئەو کوڕە دەکوژم . هەیا س دەڵێ قــوربــا.ن کوشتنی وی بوئێمە هیچ قـا زا نجی نیـــە بـا لێرەی فــڕێ بدەین بۆخــۆی دەمرێ. لــەو ێ. لــە زا رکی ئەشکەوتەکە فڕێی دەدەنودەڕۆن.

ئەزقەزا هێلانەی سیمور غێکیش لەوئەوشکەوتە دەبێ .وەختێک سیمور غەکەدێتەوە ،تەما شا دەکـا منداڵێک لەوێ کەوتووە . دەستی دەدا تـــێ و دەیبا تەوەئەشکەوت ولەوێ بــەخێوی دەکـــا تا گــەورە دەبێ .

رۆژێک لەڕا وێ تەمـا شا دەکا کەلاکەئەسپێک. ، لەوێ کەوتووە .دەستی دەدا تێ وبۆئەومنداڵەی دێنێتەوە ، بۆ ئەوەی کەوەختێک سیمورغ لـــە ماڵ نەبوو خۆی پێ بخا فڵێنێ وەڕەزنــەبــێ . رۆژێک سیمورغ دەچێتەڕا وی سـوڵتا ن مەحمـودو هەیا سیش ڕێیا ن دەوێ دەکەوێ منا لــەکــەلــەو وەختە سەرلە کەلاکە ئەسپەکە دێنێتەدەر.

وەختێک ئەوا ن دەبینێ سەردەوێ دەنێتــەوە هــەیا سیش دەی بینێ دەنگێ نا کا .

کەمدەڕۆن وزۆر دەڕۆن هەیا س خەندەیەکـی دێتێ .سوڵتا ن دەڵێ هەیا س ئەوخەندەیەچبوو؟

دەڵێ هیچ: دەڵێ حەتمەن دەبێ پێمبڵێـــی. دەڵێ ئەوجێیەی کە کەلاکە ئەسپەکـەما ن لــێ دیت ، هەر ئەوجێگا یەبووکـەمنداڵەکەمـا ن لێ فڕێ دا بوو . منداڵەکەلەنێوکەلاکەکەدا بوو .

وەختێک ئێمەی دیت ،خۆی حا شا ردا ورۆیشتە۔ وەنێو کەلاکەئەسپەکە .سوڵتا ن دەڵێ:

با بگەڕێینەوە . دەبینن منا ڵەکەلەنێوکەلاکــە دا یە.دەری دێنن ودەڕۆنسوڵتا ن دەڵـــــێ دەیکووژم. هەیا س نا یەڵێ و دەڵێ:

نا یەڵم .دەڵێئەدی چی لێ بکەین:

دەڵێ دەچینە کن وەستا ی سندووقێکی بــۆ دروست دەکەین ودەچۆمــی دا وێین .دەڵـــێ زۆر با شە . دەچنەکن وەستا ی سندووقێکیبەدوولیرا ن پێ دروست دەکەن ودوا یە منداڵەکــە دەنێـــو سندوقەکە دا وێن وبەچــۆمــیدا دەدەن. ئەوجار دەڕۆنئا شێکیش لــەبەرئەوئا وە دەگەڕێوەختێک، ئا شەکەڕا دەوەستێ تەما شا دەکەن سندووقێکـی دەبەرپەڕەکا ن دا یەسندووقەکەی دەردێـــنــن ئا شەوا ن دەڵـــێ:

با لێرەبێ هەرکەسێکی ها ت با لەسەریدا نیشێ رۆژێک ژنی ئا شەوا ندەڵێ:

دەچنە نێوباغەکەبەکوڕەکەی دەڵێن بڕۆ
هێندێ میوەن بۆبێنە .کوڕەکەدەچێ میوەیان

ئەری پیاوە باهەڵی گرین بزانین چی
تێدایەبەڵکووخوا ڕزقی بۆناردبین وزێڕی تێدا
بێ.دێن هەڵی دەگرن تەماشادەکەن منداڵێکی
سێ ساڵانەی تێدایە . دەڵێن خوایە زۆرشوکر
ئێمەوەجاخ کوێر بووین. منداڵیشت داینێ
دێن بەخێوی دەکەن تاگەورەدەبێ.

بۆدێنێ.دەیخۆن وهەڵدەستن دەڕۆن.کەم دەڕۆن.زۆر
دەڕۆن. هەیاس خەندەیەکی دێتێ سوڵتان دەڵێ
ئەو خەندەیە چ بوو.دەڵێ:
ئەوکوڕەی بە چۆمیمان دادا ئەوباغەوانە
بوو ، دەگەڕێنەوەکن کوڕەکەی.کوڕەکەبە

هەرچی زووئەو
کوڕەهات لەسەری
بدەن ...

باغێکیان دەبێ دەیکەنەباغەوان.
ڕۆژێک هەیاس وسوڵتان بەوێدا ڕادەبرن،
سوڵتان بە هەیاس دەڵێ !
با لادەینە ئەوباغەی هێندێک میوەی بخۆین..

- خێرهاتنیان دەکا . سوڵتان نامەیەکی نووسی
و گوتی:
ئەی وەزیران وکاربەدەستان هەرچی زووئەو
کوڕەهات لەسەری بدەن ، نامەکەی وەکوڕەی
دەدن . کوڕە دەبن کڵاوی دەنێ.چونکەئەمە و
وەختی عادەت وابوونامە بەر نامەیاندەبن

کلاوی دەنا ئەوجار دەڕوا زۆر ماندو دەبێ لە قەراغ شاری باغێکی لێ دەبێ لا دەداتە باغەکە لەوێ لەسەر کانی ئاو دەخواتەوە خەوی لێ دەکەوێ ئەو باخەشی کچی سولتان مەحمود بووە. وەختێک کچەکە دێتەنێو باغ تەماشا دەکا کوڕێکی زۆر جوان لەسەر کانی یە کەخەوی لێکەوتووە. ئاشقی دەبێ.

دەچێتە پێش تەماشادەکا کلاوەکەی لەسەر بەر بۆتەوە ونامەیەکەی دەخوێنێتەوە زوو، نامەکەی دەدڕێنێ.هەرئەووەختێنامەیەکی دیکە دەنووسێ بە زمانی بابی دەلێ:

ئەی وەزیران هەرکە ئەوکوڕە هاتکچی منی لێ مارەبکەن.نامەکەی لەنێو کلاوەکە داوێو دەڕوا. وەختێک هەڵدەستێ کلاوەکەی لەسەر دەنێتەوە، کچەکە دەلێ:

بۆ هاتوویە باغی من، دەلێ ماندووبووم لێرە خەوملێکەوت دەبێ بم بەخشی، هەڵدەستێ دەڕوا بۆسەرای پاشا، نامەکەی وەزیرەکان دەدا. وەختێک نامەکەی دە خوێننەوە وبەژنی پاشای دەلێن سولتان فەرموویەتیکچی

من لەو کوڕە مارەبکەن .ژنی پاشا دەلێ:

ئەمن قسەی پاشا ناشکێنم لێی مارەکەن.

تاسولتان دێتەوە منداڵێکیان دەبێ. دێن منداڵەکە لە کۆشی سولتان داوێن.سولتان ماچی دەکا ودەلێن ئەوە نەوەی تۆیە.دەلێ:

خۆئەمن چ کوڕم نیە کە ژنیان هێنا بێ وەچ کچیشم نیە کە مێردیان کردبێ ئەدی بۆ ضەوەی منە، دەلێن ئەدی قوربان ئەتۆ ئەو

کوڕەت نەناردبوو کەکچی تۆی لێ مارە بکەن سولتان دەست بەرزدەکاتەوە دەلێ ئەی خوایە سەرفی نەزەرم لێ بکەبمبوورە. هەرکەسێک کە ئەتۆ چارەی بنووسی بەکەس رەدنا کرێتەوە. ئەمیش ئەوکوڕەم کردە کوڕی خۆم ولە جێگای خۆم دانا.

## دیاری

## مەتەڵ

زاری لە پشتێ
بۆخۆی لە بەردێ
هێزی لە عاردێ

زمانی لە پشتێ
کلکی لەتەنیشتێ
رزقی لەدەشتێ

ئەو تاقە دەکا
ئەو تاقە دەکا
چاو لەهەمووکەس دەکا

دەخورێ گۆشتی نیە
هەڵدێ لاقی نیە

دەنگی هەیە ورەنگی نیە
فڕێ دەدا دەستی نیە

تێکردنی سوننەتە
لەقاندنی فەرزە

بە دەست شێرە
بەپێست پڵنگە
بە چاو بازە

## پەندی پێشینان

بار بەلابار ناگاتە هەوار.
قەدری زێڕی لەکن زێڕینگەرە.
بەسەد دەرزییان گاسنێکیان تێ نابێ.
هەر زاڵمەی زەواڵێکی هەیە.
کابرایان لە دێی رێ نەدەدا لەماڵی کوێخای دەپرسی.
قەلیش بە قەلی دەڵێ رووت رەش بێ.
٣٠ـ لەترسی گێرە بووەبەوشتر
هەر دەردەی دەرمانێکی هەیە.
بەرخ هەر لەبن سەوەدا نابێ
نانی بدە بەسەگی مەیدە بە نامەردی.
نە بە پێکەنینی ئاغا تێکەوە
نە بە خۆشی زستان.
کەچەل بەزۆری ناچێتە مازوان
جارێک سنگ دەخوا جارێک سنگ دەکوتێ.
وا نەدراوە بدروێتەوە.
بە هەڵوا هەڵوا کوتن دەم شیرن نابێ.
بزن ئەگەر ئەجەلی هات نانی شوانی دەخوا.
ردێنم لەبەر تاوێ سپی نەکردووە.
تا دۆ پتربێ کەشک رەقترە.
چێشتی خۆش لەئەنگۆرێ رادیارە
سەری نایەشێ پرێسکەی لێ دەبەستێ.

- می یێ بلنگێ می یێ بزنێ ژی بلنگێ بزنێ داردا دکەن،
- گۆلکەک دێل بریـــخ ناڤێ گاڕانەکی خراب دکە.
- گامێش (گەل) نـغـدێ گامێشان هلددە وهەسپ رەقەسێ هەسپان.
- بارێ هێسترا چفتەک گران چێترە.
- ئەجەلێ بزنێ هات چوو نانێ شڤانی خار.
- نێری حەمموونیرینەنێری یێ شەڤەرەشا ئایرینە.
- نێری رەت بوون گۆتن گیسکا تووش.
- مادیک نەبەسبە نابە؟
- مێر دمرن ناڤ دمینن گادمرن چەرم دمینن
- گا بمرە کێرزەعف دبە
- گولکێ مالێ ژگایێ مالێ ناترسن.
- گۆلک دبن گا، گا نابن گۆلک.
- برا برایە بازارجودایە
- ب با وبارانێ، عەمرێ بەفرێ کێم دبە
- دبێژە کێرووشکی برەڤ دبێژە تاژیبگرە.

حەسەن نادری رەحمەتی میوانی دێ وگۆشتیان نابێ . تاوێک لەلای میوانان دادەنیشێ ودوایە بانگی خێزانی دەکا ودەڵێ:

- دابچۆ ماڵەحاجی ... بڵێ حەسەن دەیگوت میوانمان هەیە ودەستم بەهیچ کوێ راناگا مریشکێکم بۆبنێرێ .پێشانی میوانانی دەدەم . ئەوانیش نایەڵن سەری ببڕم . بەغار بۆی دەنێرمەوە .

لەماڵێک میوان کرابووین جێگام زۆرخۆش بوو لەخودام دەویست سێ چوار رۆژی دیکەش لەوجێگە بمێنمەوە . باوکیشم زۆر بەلەزبوو .

شەوکەهەموو خەوتن . هەر کەسە ددانی مەسنووعی دەرێنا ولەجامەئاوی هاویت ولەبن سەری دانا . ددانی سەرووی بابم وخانەخوێ ومیوانەکەی دیکەم گۆڕی . ئەورۆژە هەتا ئێوارەبۆیان لێک نەبووە و شەوێکی دیکەش مانەوە .

کاک مەنافێکمان دراوسێ بووسەری زۆر چکۆلە بوو ، دەتگوت خڕکەبەردە !

رۆژێک لێم پرسی

ئەدی سەرت بۆوا چکۆلەیە؟

- بۆخۆم وام پێخۆش بوو

حاکم دەستووری بەخەڵکی شاردا بەرۆژبخەون وبەشەوکار بکەن .

رۆژێک تەماشای کرد ئەوە کابرایەکی پینەچی بەنوێژی نێوەڕۆ فتیلەیەکی گراندووە حاکم زۆر توورەبوو . دیتی نەک هەر یەک بێ قسەی ئەوی کردووەو بەرۆژ کار دەکا فتیلەشی هەڵکردووە . گوتی:

کوڕەکابرا ئەوفتیلەچیە هەڵت کردووە ؟

- قوربان ئێستا شەوکار دەکەم . چون بەرۆژ هیچ کەس دیارنیە و مەجبوورم ، شەوکاریشی بەبەرەوە بکەم دەناڵەبرسان دەمرم .

- "ئورمیا" یا "ورمێ" یانی چی ؟

- یانی "شاری ئاو" شارێک کە ئاوی زۆرە .

- ئەدی بۆ ئاوی ماڵی ئێمە هەر رۆژنا رۆژێک قەتع دەبێ .

- برۆ لەو دەریاچە زەلامەو لەهەموو چۆم وروبارە ئاو بێنە!

- شێت بووی! چ لەو ئاوە تاڵ وسوێرە بکەم . ئاوی شیرینمان دەوێ . چۆڕێکمان ئاونیە! لە خۆڕا ناوی ئەم شارەیان ناوە "شارئاو"!

- لە خۆڕا نیە مەگەرئەو دەریاچە زەلامەت نەدیوە؟

- کارم بە دریاو دەریاچەچیە؟ من لیوانێکم ئاوی تەسفیەکراوی شیرین دەوێ بیخۆمەوە .

بابەگیان "ئورمیا" یا "ورمێ" مانای "شاری ئاو" نەک "شاری خاوەن ئاوی تەسفیە کراوی لولەکێشی کراوی دەلیوان کراو!" **هەمەوەند**

**تێبینی : لە پڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بە پێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە ڕەچاو کـــراوە جگە لەوەی نیشانەی(٧) دانەنراوە.واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی( شڕ، گوڵ،زۆر ،شێرو ..)ی تێدا بێ بە شکڵی(شر ،گول،زور ،شیرو ..)دەنووسرێ.**

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧ ٨ ٩ ١٠ ١١ ١٢ ١٣ ١٤ ١٥

١- شاعیری بەناوبانگی کورد کە ماموٚستا هەژار شەرحی لەدیوانە بەناوبانگەی کردووە- خزمەتکاری فەرهەنگ وئەدەبی کوردی ٢- ئاواڵـــی پووچ بـــۆس - گوندی ناوچەی شنۆ و پیتێکی ئەلف وبێ - شاری ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات ٣- بۆی هەولێر - خۆش وبەتام لێرو هەڵەمووت ٤- بەیانی زوو- دنیای شیماڵ - سنعەتکاری پۆپەشمیـــن ٥ - مەڵبەندێکی کوردستانی تورکیا - وشە و کەلیمە - هەگەر وعیللەت ٦- ئـــازاد وڵاتیکی ئامریکای لاتین ٧- دوو جـــار پیتێک - تەشەر وتانە - ئوتێلی مەڕ- ٨- دۆستی زێرە بەڵام قەت نایگاتـــێ قاش ونەقیم- کۆسەکەی راتێکی گەورەیە ٩- ڕۆژ وخۆر- بێگانە دەڵـــێ چـــی! کەرەستەی شەڕی قەدیم ١٠- گـــۆشتی هەڵچزاوی لە کووپە کراو- ئەویش هەر درۆیە ١١- دوژمنی ساغی و سڵامەتـــی نوور وبریقە ١٢- نیشانەی هەڵبژاردن داوینی چیا- پووزەوانە و دولاخ ١٣ - فرش کردن - قەڵای مێردان ١٤- گێژ و خەواڵوو - لق - بەیار ١٥- شاعیـــری رووناکدڵی کرماشان و خاوەنی کتێبی چەپکە گوڵ .

١- گوندستێنێکی ناوچەی سەردەشت - چووەتە زیارەتی خانەی خودا ٢- هومێد- گوڕ و تین - کەیبانووی کەڵ ٣- برین دەیدا بەڵام بەراوەژوو - باتڵاق - کاولەلەحسای ســـوارۆ لەو وڵاتە هەڵکەوتووە - نەگبیر ٤- شارەزا و هەڵکەوتە ٥- لە تەوراتدا بەخوا دەڵێـــن ململانێ ٦- مانگێکی ساڵ - ژمارەیەکە ٧- ڕەوانناسی سویسی - حەسانەوە ٨- شاری کەویـــر خزمەتی مزگەوت دەکا - ئەستۆی سەراوبن ٩- دەبێ بە ڕێداری بسپێری - تازە - ناشارەزا و بێگانە - ورد بوو ١٠- گوندێکی ناوچەی خانێ - سووک وچرووک ١١- زۆر تێر- جۆر و تـــەرز بای دلداران ١٢- ژمارەی مانگ- نووسەری بەناوبانگی کتێبی سپید دندان - بــــەرز ١٣- خۆراکێکە بەڵام ئێمەمانان نایخۆین - لاستیک - هاوڵە و خوریک ١٤- شاراوە - بارانـــی توند ١٥- خۆر - بەدوان دەبێتە بارێک - هەگەر و بنـــۆس .

| ١٥ | ١٤ | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٠ | ٩ | ٨ | ٧ | ٦ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ک | ش | ■ | گ | ە | ب | ی | ک | ە | ز | ن | ی | م | ە | ژ | ١ |
| ا | ی | ر | و | ■ | ل | ی | و | ■ | و | ە | ■ | ی | ە | ە | ٢ |
| ک | س | ■ | و | ا | ی | ■ | ن | ا | ر | ی | ە | ر | و | ح | ٣ |
| ە | ■ | ی | ە | ■ | م | و | د | ■ | خ | ■ | د | ا | ر | م | ٤ |
| م | س | ■ | ن | و | ە | ت | ■ | ل | ا | ت | ■ | ن | ا | ە | ٥ |
| ی | ر | ە | د | ■ | ت | ا | ب | ە | ن | ■ | س | ■ | م | د | ٦ |
| ر | و | ە | ■ | ف | ■ | ر | و | ■ | ە | د | ی | ر | ا | ی | ٧ |
| و | ە | گ | ە | ر | ز | ■ | ن | م | ■ | و | ا | ک | ن | ح | ٨ |
| ک | ■ | ا | ■ | چ | ی | م | ■ | ر | ی | م | و | ە | ■ | ا | ٩ |
| ا | ■ | ر | و | گ | ■ | ت | ە | ق | ا | ی | ل | ■ | م | ن | ١٠ |
| ک | ش | ی | ت | ■ | ر | م | ■ | ■ | د | ن | ە | ب | ■ | ی | ١١ |
| ە | ل | ■ | و | ر | ن | ا | ۆ | ج | ■ | ی | ■ | ە | گ | ■ | ١٢ |
| ش | ■ | س | و | و | د | ن | س | ■ | و | ر | ر | ی | ش | ■ | ١٣ |
| ی | ج | ن | ی | ل | ■ | ە | م | ی | ر | ە | ج | ■ | ت | ش | ١٤ |
| خ | ■ | ە | ژ | ە | ە | ■ | ە | ■ | ە | ن | ا | ب | ■ | ە | ١٥ |

**لەنێو ئەو کەسانەیدا کەپڕکراوەی ئەم ژمـــارەی سروەمان بۆبنێرن، یەک کەس بەپێی پشک بەبەرەنـــدە دەناسرێ. بەمەرجێک ئەمخاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرێ:**

**١- جەدوەلەکە بەخەتێکی خۆش بنووسرێ وابێ پیتەکان بێنەخوێندنەوە.**

**٢- ئەسڵی جەدوەلەکەمان بوبنێری لەکاغەزی دیکەدا بەشداری نادرێ.**

**٣- لانی زۆر پازدە ڕۆژ پاش دەرچوونی گۆوار پڕکراوەی جەدوەلەکەی ناردبێ.**

**٤- پڕکراوەی جەدوەلەکە هەڵەی تێدا نەبێ**

**جایزەی پڕکردنەوەی جەدوەل ساڵێک ئابوونمـــانی گـــۆواری سروەیــە .**

قادر باپیری - مەهاباد

خالید قەلەکووهی - بۆکان

ناسر کەریمی - بانە

نامیق کۆهندپووشی - مەریوان

خالید ئیسماعیلی - مەهاباد